# السُّنَّة

نووسینی

أَبِي عبدِ ٱللهِ مُحَمَّدِ بْنِ نَصْرٍ ٱلمَرْوَزِيِّ

(٢٠٢ - ٢٩٤ هـ)

وەرگێڕانی

مَجد الحَنبَلي

صفر/ ١٤٤٥

# پێڕست

# پوختەیەك لە ژياننامەی ئەم ئيمامە بەڕێزە

ناو : محمد بن نصر بن الحجاج المروزي .

كونيه : باوكی عبدالله .

لە دايك بوون : لە ساڵی (**٢٠٢** ھ) لە بەغداد لە دايك بووە و لە نەيسابور پێگەيشتووە، دواتر لە سەمەرقەند دانيشتووە .

وەفاتی : لە تەمەنی **٩٢** ساڵيدا لە مانگی موحەڕەمی ساڵی (**٢٩٤** ھ) لە سەمەرقەند وەفاتی كردووە رحمه الله .

## مامۆستاكانی :

١ - أحمد بن حنبل .

٢ - إسحاق بن راهويه .

٣ - محمد بن يحيى الذهلي .

٤ - يحيى بن يحيى التميمي .

٥ - محمد بن بشار، وە لە زۆرێكی ترەوە گوێی لە فەرموودە بووە .

## قوتابیەکانی :

١ - ابو العباس السراج .

٢ - محمد بن المنذر شكر .

٣ - ابو حامد بن الشرقي .

٤ - محمد بن يعقوب بن الأحزم .

٥ - وە کوڕەکەی خۆی اسماعيل بن محمد بن نصر، وە زۆرێکی تر .

## وەصف و پیاهەڵدانی زانایان دەربارەی :

١ - القاضي محمد بن محمد وتی : شێخەکانی سەرەتامان دەیان وت : پیاوانی خۆراسان چوارن : ابن المبارك، و ابن راهويه، و ويحيى بن يحيى، وە محمد بن نصر .

٢ - عبدالله بن محمد الإسفراني وتی : گوێم لە عبدالله بن عبدالحكيم بوو دەیوت : محمد بن نصر لە مصر پێشەوا بوو، جا چۆن لە خۆراسان؟ - واتە ئەگەر لە وڵاتێکی تر پێشەوا بووبێت دەبێ لە وڵاتەکەی خۆی چۆن بووبێت - .

٣ - محمد بن اسحاق الدبوسي وتی : چووم بۆ سەمەرقەند و محمد بن نصر المروزي م بینی، ئەو دەریایەك بوو لە فەرموودە .

٤ - ابو بكر الصبغي وتی : گەیشتم بە دوو پێشەوا و ڕزقی ئەوەم پێنەدرا کە لێیانەوە ببیستم : ابو حاتم الرزاي، و محمد بن نصر المروزي، جا نوێژم نەدیوە باشتر بێ لە نوێژی ابن نصر، پێم گەیشتووە کە زەردەواڵەیەک چووەتە سەر ناوچەوانی، وە خوێنی لە ڕوخساری هێناوە کەچی جووڵەی نەکردووە .

## پوختەیەك لە گەشت کردنی بۆ بەدەستهێنانی عیلم :

هەمیشە خەمی ئەهلی فەرموودە و ئەثەر ڕووی کردۆتە ئەوەی کە گەشت بکەن بۆ شارە ئیسلامییەکان بۆ دەستکەوتنی عیلم، و گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لە زانایانی فەرموودەوە، وە ئەم گەشت کردنانە سوود و کاریگەری گەورەی هەبووە بۆ موسڵمانان لە چالاك کردنی جوڵەی عیلم و ڕۆشنبیری لە وڵاتانی ئیسلامیدا، بۆیە گەشت کردن بۆ لای زانایانی وڵاتان بووە بە ڕێبازی ئەهلی فەرموودە .

ئیمام محمد بن نصر یش پشکێکی دیاری هەبووە لەم گەشتکردنانە، لە سەرەتادا لە شێخەکانی ناوچەی خۆیەوە عیلمی وەرگرتووە پاشان هەر زوو ڕووی کردۆتە ناوچە ئیسلامییەکانی وەکو خۆراسان، و الري، و بەغداد، و کوفە، و بەصرە، و مەککە و مەدینە، و شام، و مصر .

وە وا دەردەکەوێ کە یەکەم گەشتی لە ساڵی (**٢٢١ هـ**) بووبێت لەبەر وەفات کردنی عبدان بن عثمان ی شێخی، وە یەکەم گەشتی بۆ مرو و بەغداد و خۆراسان و مەککە بووە .

**١** - له ابي سعيد الخدري ـەوه رضي الله عنه، دەربارەی ئەم ئایەتە : ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ﴾ [**الحجرات : ٤**]، فەرمووی : ئەمە پێغەمبەرەکەتان و باشترینی ئوممەتەکەتانە، جا ئێوە چۆن؟

---

: والله اعلم، ئایەتەکە لەو کاتە دابەزیوە کە وەفدی بەنی تمیم هاتوون بۆ مەدینە لە ساڵی (**٩ هـ**)، وە باس لەوە دەکات کە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بە قسەی بکردنایە تووشی بارگرانی دەبوو، ابي سعيد یش فەرمووی ئەمە بۆ پێغەمبەرەکەتان ئاوایە ئەی بۆ ئێوە چۆنە؟

**٢** - **ابو عبدالله** - نوسەری کتێبەکە - وتی : وە الشافعي وتی : بەشێك لە ئەهلی عیلم وتیان : وەلی ئەمرەکان ئەو کاربەدەستانەن کە لە سریەکانی رسول الله ﷺ بوون، - نوسەر - وتی : وە ئەمە لەوە دەچێ کە ئەو وتی، والله اعلم .

چونکە ئەو عەرەبانەی کە لە چواردەوری مەککە بوون فەرمانڕەوایەتیان نەدەزانی، وە داوایان دەکرد کە هەندێکیان گوێڕایەڵی فەرمانڕەوایی بدا بە هەندێکی تریان، ئینجا کە گوێڕایەڵی درا بە رسول الله ﷺ گوێڕایەڵی بە ڕەوا نەدەبینرا بۆ هیچ کەس لە غەیری رسول الله ﷺ ، جا فەرمانیان پێکرا گوێڕایەڵی ئەو کاربەدەستانە بکەن کە رسول الله ﷺ کردنی بە کاربەدەست، نەك گوێڕایەڵیەکی گشتی، بەڵکو گوێڕایەڵیەکی جیا لەوەی خۆیان، هەروەکو الله

فەرموویەتی : ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ﴾، واتە : ئەگەر جیاوازیتان تێکەوت لە شتێکدا، والله اعلم واتە : خۆیان و ئەو کاربەدەستانەیان کە فەرمانیان پێکراوە بە گوێڕایەڵیان ﴿فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ [النساء : ٥٩]، والله اعلم واتە : بۆ ئەوەی کە الله و پێغەمبەرەکەی فەرموویانە، جا ئەگەر لەو شتەی کە ناکۆکیان تێ کەوت هیچ دەقێك بوونی نەبوو لەو دوانە یان لە یەکێك لەو دوانە، ئەوا قیاس دەکرێتە سەر یەکێکیان .

---

: مەبەستی ئیمام ئەوەیە ئەگەر کاربەدەست و خەڵکەکەی ژێر دەستی لە شتێکدا ناکۆکیان تێکەوت ئەوا بۆ نەمانی ناکۆکیەکە بگەڕێنەوە بۆ قورئان و سوننەت، جا ئەگەر ئەو شتە لە قورئان و سوننەت نەبوو قیاس دەکرێتە سەر یەکێکیان، هەروەها سریە واتە مەفرەزانەی کە پێغەمبەر ﷺ ناردوونی و خۆی لەگەڵیان نەبووە، بەڵام ئەگەر خۆی لەگەڵیان بووبێت پێی وتراوە غەزا، والله اعلم .

٣ - وە گوێم لە اسحاق بوو دەربارەی فەرمایشتی : ﴿وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ﴾، وتی : دەکرێ ئایەتەکە تەفسیر بکرێ بە خاوەن عیلمەکان، وە بە کاربەدەستی سریەکان، لەبەر ئەوەی زاناکان یەك ئایەت تەفسیر دەکەن لەسەر چەند ڕوویەك، ئەمەش خیلاف و جیاوازی نیە .

چونكه سفيان بن عيينة وتويەتى : لە تەفسيرى قورئاندا جياوازى بوونى نييە ئەگەر وتەكان هەموويان دەربارەى ڕاست بن، وە وتويەتى : ئايا هيچ شتێك لە ڕووكەشدا جياوازى تێيدا ديارترە وەك لە (الخُنَّس)؟ عبدالله بن مسعود فەرموويەتى : - الخُنَّس - بە واتاى مانگاى كێوى دێت، وە علي فەرموويەتى : - الخُنَّس - ئەستێرەكانە .

سفيان وتى : هەردووكيان يەك شتن، چونكە ئەستێرەكان بە ڕۆژ ديار نامێنن و بە شەو دەردەكەون، وە كێويش ئەگەر مرۆڤ ببينێ ئەوا لە شوێنێكى چڕ و پڕ يان غەيرى ئەودا خۆى دەشارێتەوە، وە ئەگەر مرۆڤ نەبينێ ئەوا دەردەكەوێ، سفيان وتى : بۆيە هەردووكيان خُنَّس ن .

**٤** - اسحاق وتى : وە بە ڕاست خستنەوەى ئەمە بريتيە لەوەى كە لە هاوەڵانى محمد ەوە ﷺ هاتووە دەربارەى (الماعون)، واتە هەندێكيان وتويانە : - الماعون - زەكاتە، وە هەندێكيان وتويانە : - الماعون - پێسپاردنى شتومەكە . عكرمة وتويەتى : بەرزترينى زەكاتە، و پێسپاردنى شتومەكيش لەوە .

**٥** - اسحاق وتى : كۆمەڵێك كەس ئەم واتايانەيان نەزانى، ئەگەر وشەيەك لەگەڵ وشەيەك ڕێك نەكەوتايە، دەيان وت : ئەمە خيلاف و جياوازيە، لە كاتێكدا الحسن كە باسى ئەم جياوازيانەى كردووە لەم ڕووەى كە ئێمە وەسفمان كرد، وتويەتى : ئەم كۆمەڵە كەسە لە عەجەمەوە هێنراون - واتە غەيرە عەرەب بوونە و تێنەگەيشتوون، والله اعلم - .

٦ - **ابو عبدالله** وتى : الله پێغەمبەرەكەى ﷺ مراند دواى ئەوەى كە دینەكەى تەواو و كامڵ كرد بۆ موسڵمانان، هەروەكو فەرموویەتى : ﴿**الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا**﴾ **[المائدة : ٣]**، ئەم ئایەتە ئەو كاتە دابەزى كە رسول الله ﷺ لە عەرەفات وەستابوو، جا لە دواى ئەم ئایەتەوە نە حەڵاڵ دابەزى نە حەرام - واتە لە دواى ئەمەوە هیچ شتێك حەرام یان حەڵاڵ نەكرا و پێش ئەم ئایەتە چى حەرام یان حەڵاڵ بووبێ وەكو خۆى ماوەتەوە -، وە رسول الله ﷺ گەڕایەوە و وەفاتى كرد .

وە الله تبارك و تعالى فەرمانى پێكردن بە كۆبوونەوە لەسەر ئەوەى كە ئەو پێى ماتووە - واتە ئەوەى بۆ رسول الله ﷺ ماتووە - ، وە نەهى لێكردن لە تەفرەقە و جیا جیا بوون دواى ئەوەى كە ڕوون كردنەوەیان بۆ مات، هەروەكو فەرموویەتى : ﴿**وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا**﴾ **[آل عمران : ١٠٣]**، وە فەرموویەتى : ﴿**وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخْتَلَفُواْ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ**﴾ **[آل عمران : ١٠٥]** .

٧ - وە رسول الله ﷺ فەرموویەتى : (سیلەى ڕەحم مەپچڕێنن، و پشت لە یەكتر مەكەن، بەڵكو ببەنە بەندەى الله و براى یەكتر) .

٨ - وە فەرموویەتی ﷺ : (با جیاوازی و خیلافتان تێنەکەوێ، بۆ ئەوەی دڵتان جیاوازی تێ نەکەوێ) .

٩ - وە فەرموویەتی ﷺ : (هەر کەس ناوەڕاستی بەهەشتی ویست ئەوا با پابەندی جەماعەت بێت) .

١٠ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ڕقتان لە یەکتر نەبێ، و حەسودی بە یەکتر مەبەن، وە پشت لە یەکتر مەکەن، بەڵکو ببنە بەندەی اللە و برای یەکتر، وە حەڵاڵ نیە بۆ موسڵمان زیاتر لە سێ شەو قسە لە براکەی دابڕێ) .

---

: لێرەدا مەبەستی قسە دابڕین نیە لە ئەهلی بیدەع بەڵکو مەبەستی لە قسە دابڕینە لەبەر کاروباری دونیا، لەبەرئەوەی قسە دابڕین لە ئەهلی بیدەع واجب بووە لای سەلەف .

١١ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (نەکەن گومان ببەن، چونکە گومان درۆترین وتەیە، وە گوێ شل مەکەن، و جاسوسی مەکەن، وە مونافەسە مەکەن، و حەسودی مەبەن، وە ڕق مەڵمەگرن، و پشت لە یەکتر مەکەن، بەڵکو ببنە بەندەی اللە و برای یەکتر) .

وه الله عز و جل فەرموويەتی : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ﴾ [الأنعام : ١٥٣]، جا الله پێی ڕاگەیاندوین کە ڕێگاکەی یەك دانەی ڕاستە، وە ڕێگاکان زۆرن و ئەو کەسەی شوێنیان دەکەوێ لە ڕێگە ڕاستەکەی لادەبەن، پاشان پێغەمبەر ﷺ بە سوننەتەکەی بۆمانی ڕوون کردۆتەوە :

**١٢** - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ خەتێکی بۆ کێشاین، پاشان فەرمووی : (ئەمە ڕێگای الله یە)، دواتر چەند خەتێکی لە ڕاست و چەپی خەتەکەوە کێشا و فەرمووی : (ئەمانەش ڕێگاکانن، لەسەر هەر یەك لەم ڕێگایانە شەیتانێك هەیە و بانگەشەی بۆ دەکات) پاشان ئایەتی : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ﴾ ی خوێندەوە .

**١٣** - لە عبدالله وە : کە پێغەمبەر ﷺ ئایەتی : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ﴾ ی خوێندەوە، جا خەتێکی کێشا و فەرمووی : (ئەمە ڕێگاکەیە - واتە ڕێگە ڕاستەکە - ) وە چەند خەتێکی لە دەوری خەتەکە کێشا و فەرمووی : (ئەمەش ڕێگاکانن، هیچ یەکێك لەم ڕێگایانە نیە ئیللا شەیتانێکی بە سەرەوەیە و بانگەشەی بۆ دەکات) .

**١٤** - لە جابر بن عبدالله وە رضي الله عنهما فەرمووی : لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، کە خەتێکی کێشا و فەرمووی : (ئەمە ڕێگای الله یە)، وە دوو

خەتی لە ڕاست و چەپی خەتەکەوە کێشا و فەرمووی : (ئەمەش ڕێگای شەیتانەکانە) پاشان دەستی لەسەر خەتی ناوەڕاست دانا و ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ [**الأنعام : ١٥٣**] .

**١٥** - لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما فەرمووی : رسول الله ﷺ بە دەستی خەتێکی کێشا لەسەر زەوی، پاشان باسی فەرموودەکەی کرد .

**١٦** - وە سعيد لە شوێنێکی تردا بۆی باس کردین لە جابر بن عبدالله ـوە .

جا الله پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاگاداریان کردووینەتەوە لە داهێنراو و ئارەزووە لادەرەکان لە فەرمانی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، پاشان پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندوین کە الله واز لە بەندە ئیمانداراەکەی ناهێنێ تەنها بەوەی کە لە کتێبەکەیدا یان سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا بۆی ڕوون کردۆتەوە، تاکو ئامۆژگاری نەکات و ئاگاداری نەکاتەوە بەو مەترسیەی دڵی، بۆ ئەوەی بەوە بیپارێزێ لە بانگەوازی شەیتانەکان بۆ لاچوون لەسەر ڕێگاکەی و لاچون لەسەر ڕێی ڕەزامەندیەکەی .

**١٧** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (الله نمونەیەکی بۆ ڕێگای ڕاست هێناوەتەوە، وە لە هەردوو لای ڕێگاکەوە دوو دیوار هەیە کە چەند دەرگایەکی کراوەیان تێدایە، وە پێم وابێ فەرمووی لەسەر دەرگاکان چەند پەردەیەك هەیە،

وه لەسەر دەرگای ڕێگاکە بانگکەرێك هەیە دەڵێ : خەڵکینە، هەمووتان وەرنە ناو ڕێگاکەوە، و لامەدەن، وە بانگکەرێکی تر هەیە لە سەرووی ڕێگاکەوە بانگ دەکات، هەر کەسێك ویستی شتێك لەو دەرگایانە بکاتەوە پێی دەڵێ : هاوار بۆ تۆ نەیکەیتەوە، چونکە ئەگەر کردتەوە ئەوا خۆتت پێ ناگیرێ و دەچیتە ناوی - واتە ئەم بانگکەرەیان ڕێگری دەکات لەوەی خەڵکی بچنە ناو دەرگاکانی دوو دیوارەکەوە - .

جا ڕێگاکە : ئیسلامە، وە پەردەکان : سنورەکانی الله ن، وە دەرگا کراوەکان : حەرام کراوەکانی الله ن، وە ئەو بانگکەرەی سەر ڕێگاکە : کتێبی الله یە، وە بانگکەری سەرەوە : ئامۆژگاریکاری الله یە لە دڵی هەموو موسڵمانێکدا) .

---

: مەبەستی ئەوە نیە کە ئامۆژگاری الله بکات پەنا بە الله، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ئەو ئامۆژگاریکارە لە دڵی هەموو کەسێکدا خاوەنەکەی الله یە .

١٨ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الله باسی ڕێگای ڕاستی کردووە، وە وە لە هەردوو لای ڕێگاکەوە دوو دیوار هەیە کە چەند دەرگایەکی کراوەیان تێدایە، وە لەسەر دەرگاکان چەند پەردەیەك هەیە، وە لەسەر دەرگای ڕێگاکە بانگکەرێك هەیە بانگ دەکات لە سەرووی ڕێگاکەوە، هەر کەسێك ویستی شتێك لەو دەرگایانە بکاتەوە پێی دەڵێ : هاوار بۆ تۆ نەیکەیتەوە، چونکە ئەگەر کردتەوە ئەوا خۆتت پێ ناگیرێ و دەچیتە ناوی .

جا ڕێگاکە : ئیسلامە، وە پەردەکان : سنورەکانی الله ن، وە دەرگا کراوەکان : حەرام کراوەکانی الله ن، وە ئەو بانگکەرەی سەر ڕێگاکە : کتێبی الله یە، وە بانگکەری سەرەوە : ئامۆژگاریکاری الله یە لە دڵی هەموو موسڵمانێکدا) .

**١٩** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (الله نمونەیەکی بۆ ڕێگای ڕاست هێناوەتەوە، وە لە هەردوو لای ڕێگاکەوە دوو دیوار هەیە کە چەند دەرگایەکی کراوەیان تێدایە، وە لەسەر دەرگاکان چەند پەردەیەك هەیە، وە لەسەر ڕێگاکە بانگکەرێك بانگ دەکات، وە بانگکەرێکی تر لە سەرویەوە بانگ دەکات، وە الله بانگەواز دەکات بۆ ماڵی ئاشتی و ئارامی وە هەر کەسێکی بوێت هیدایەتی دەدا بۆ ڕێگای ڕاست، جا دەرگاکان کە لە هەردوو لای ڕێگاکەوەن : سنورەکانی الله ن، هیچ کەس ناکەوێتە سنورەکانی الله وە تاکو سیتر و پەردەی الله هەڵنەداتەوە، وە ئەوەی کە لە سەروویەوە بانگ دەکات : ئامۆژگاریکاری الله یە لە دڵیدا) .

**٢٠** - مجاهد دەربارەی فەرمایشتی الله : ﴿**وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ**﴾ [**الأنعام** : ١٥٣]، وتی : بیدعە و شوبهەکان .

**٢١** - مجاهد دەربارەی فەرمایشتی الله : ﴿**وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ**﴾ [**الأنعام** : ١٥٣]، وتی : بیدعە و شوبهەکان .

**٢٢** - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرموویەتی : ڕێگاکە ئامادەبووی لێیە، شەیتانەکان لەوێ ئامادەن و بانگەشە دەکەن : ئەی بەندەی الله، وەرە ئەی بەندەی الله، وەرە بۆ ئەم ڕێگایە .

بۆ ئەوەی لە ڕێگای الله لایانبەن، جا دەست بگرن بە گوریسی الله وە . فەرمووی : گوریسی الله کتێبی الله یە .

**٢٣** - وە ابي وائل لە عبدالله وە هەمان شتی گێڕاوەتەوە .

**٢٤** - عبدالله فەرمووی : ئەو گوریسی الله یە کە الله فەرمانی پێی کردووە بریتیە لە قورئان .

**٢٥** - عبدالله فەرمووی :ڕێگای ڕاست کتێبی الله یە .

**٢٦** - جابر بن عبدالله رضي الله عنه فەرمووی : ڕێگای ڕاست ئیسلامە .

**٢٧** - عاصم الأحول وتی : ابو العالية پێی وتین : فێری ئیسلام بن، کە فێریشی بوون پشتی تێمەکەن، وە دەست بگرن بە ڕێگای ڕاستەوە، چونکە ئەوە ئیسلامە، وە ڕێگاکە مەبەن بە لای ڕاست و چەپدا، وە دەست بگرن بە سوننەتی پێغەمبەرەکەتان ﷺ و ئەوەوە کە لەسەری بوون پێش ئەوەی هاوەڵەکەیان بکوژن وە ئەوە بکەن کە کردیان - مەبەستی لە هاوەڵەکەیان ئیمام عثمان ە، واتە دەست بگرن بەو ڕێبازەوە کە لە پێش کوشتنی ئەودا هەبوو چونکە دوای وەفاتی ئیمام عثمان وردە وردە گروپە گومڕاکان دەرکەوتن - ، چونکە ئێمە قورئانمان خوێندەوە پانزە ساڵ پێش

ئەوەی کە ماوەڵەکەیان بکوژن و ئەوە بکەن کە کردیان، وە ئاگاداری ئەو ئارەزووانە بن کە دوژمنایەتی و ڕق دەخاتە نێوان خەڵکییەوە .

- عاصم الأحول وتی : - ئەمەم بە الحسن وت ئەویش وتی : ڕاستی کرد و ئامۆژگاری کرد . وە ئەمە باس کرد بۆ حفصة بنت سيرين - خوشکی محمد بن سیرین ی تابعی - و پێی وتم : ئەهلەکەمت بە فیدا بێت! ئایا ئەمەت بۆ محمد باس کردووە؟! وتم : نەخێر، وتی : دە بۆی باس بکە .

**٢٨** - عاصم الأحول لە ابي العالية دەربارەی فەرمایشتی الله : ﴿**اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ**﴾ [**الفاتحة : ٦**]، وتی : ئەوە پێغەمبەر ﷺ و دوو ماوەڵەکەیەتی واتە ابو بکر و عمر .

- عاصم الأحول - وتی : ئەمەم بۆ الحسن باس کرد و وتی : ابو العالية ڕاستی کرد و ئامۆژگاری کرد .

**٢٩** - لە يزيد بن المرثد وە وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەموو پیاوێك لە موسڵمانان لەسەر خاڵێکی کرانەوەیە لە خاڵەکانی ئیسلام، الله بۆ ئیسلام نەیەن لە لای تۆوە) .

**٣٠** - وە الأوزاعي وتی : هیچ موسڵمانێك نییە ئیللا ڕاوەستاوە لەسەر خاڵێکی کرانەوە لە خاڵەکانی ئیسلام، جا هەر کەسێك توانی کە نەهێڵێ لە خاڵەکەیەوە بۆ ئیسلام بێن ئەوا با بیکات .

: والله اعلم، مەبەست لەم دوو ئەثەرە ئەوەیە کە ئیسلام شوبهێنراوە بە سنورێك و هەر کەسێکیش لەسەر خاڵێکە لەو سنورانە، جا نابێ لێ بگەڕێن دوژمن لێی بێتە ژوورەوە .

**٣١** - الحسن بن حي وتی : موسڵمانان بۆ ئیسلام وەکو قەڵان، جا ئەگەر موسڵمانێك داهێنانێکی ئەنجامدا ئەوا کرانەوەیەك لە - سنوری - ئیسلام لە ناو دڵیدا ڕوودەدات، وە ئەگەر موسڵمانان هەموویان داهێنانیان ئەنجامدا ئەوا تۆ جێگیر بە لەسەر ئەو کاروبارەی کە ئەگەر لەسەری کۆك بن ئەوا مەڵدەستن بە دینداری بۆ الله بەو شێوەیەی کە الله لە دروستکراوەکانی ویستووە، با بۆ ئیسلام نەیەن لە لای تۆوە .

**٣٢** - أبي أمية الشيباني وتی : گەیشتم بە أبا ثعلبة الخشني و پرسیارم لێکرد سەبارەت بە فەرمایشتی : ﴿يَأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ﴾ [**المائدة** : ١٠٥]، وتی : سوێند بە الله دەربارەی ئەمە پرسیارم لە شارەزایەك کرد، پرسیارم لە رسول الله ﷺ کرد، فەرمووی : (بەڵکو فەرمان بە چاکە بکەن، و نەهی لە خراپە بکەن، جا ئەگەر ڕژدیەکی بە گوێ کراو، و ئارەزوویەکت بینی کە شوێنکەوتەی هەبوو، لەگەڵ دونیایەکی گەورەکراو، و سەرسام بوونی هەموو خاوەن بۆچوونێك بە بۆچوونەکەی خۆی؛ ئەوا خەریکی نەفسی خۆت بە، و واز لە کاروباری خەڵکی بهێنە، چونکە لە دوای ئەمەتان

ڕۆژانێکتان دێته پێش که ئارام گرتن تێیدا وەکو گرتنی پشکۆ وایه، بۆ ئەو کەسەی که لەو کاتەدا کردەوە دەکات پاداشتی پەنجا پیاوی هەیه که هەمان کاری ئەو دەکەنەوە) وتی : زیاتری وت : پێی وترا : پەنجا لەوان؟ فەرمووی : (پەنجا لە ئێوە) .

---

: الترمذي لە (**سنن : ٣٠٥٨**) ڕیوایەتی کردوە و وتویەتی : ئەم فەرموودەیە حسن و غريبە .

**٣٣** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (لە دوای ئەمە ڕۆژانێکتان دێتە پێش کە ڕۆژانی ئارام گرتن، دەستگرتوو لەوان بەوەی کە ئەمڕۆ ئێوەی لەسەرن پاداشتی پەنجای وەکو ئێوەی هەیە) وتی :ئەی پێغەمبەری الله ﷺ، لەوان؟ وتی : (بەڵکو لە ئێوە) .

**٣٤** - وە الله عز و جل مەدح و ستایشی ئەو کەسانەی کردووە کە ئەوەی رسول الله ﷺ پێیانی گەیاند لە لایەن الله وە ئەوان قبوڵیان کرد، کە ئەوانیش کۆچکەران و پشتیوانانن لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، وە نمونەی پێیان هێناوەتەوە لە تەورات و ئینجیلدا، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿**مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ**﴾ [**الفتح : ٢٩**]، وە فەرموویەتی : ﴿ **لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ**﴾ [**الفتح : ١٨**] .

جا ئەوان لەدوای رسول الله ﷺ حوججەی الله ن بەسەر دروستکراوەکانیەوە، ئەوەی رسول الله ﷺ پێیانی گەیاند ئەوان دەیگەیەنن لێیەوە؛ چونکە بەوە فەرمانی پێیان کردوە، هەروەکو فەرموویەتی : (با ئەوەی ئامادەیە بە ئامادەنەبووی بگەیەنێت)، جا لەسەر مەنهەجی پێغەمبەرەکەیان ﷺ ڕۆیشتن، شوێنکەوتووی حوکمی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرن ﷺ، وە پێغەمبەر ﷺ مەدحی کردوون فەرموویەتی : (باشترینی خەڵکی ئەوانەی سەردەمی منن)، وە فەرمانی کردووە بە شوێنکەوتنی سوننەتەکەی و سوننەتی جێنشینە ڕاشیدە ڕێنمونی کراوەکانی دوای خۆی، وە ئوممەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە لەو داهێنراوانەی کە دوای ئەوان داهێنراون، و ڕاشی گەیاندووە کە ئەوانە بیدعەن .

وە الله زەمی ئەو کەسانەی ئوممەتانی ڕابردووی کردووە کە داهێنانیان لە دینی الله کردووە لەوەی کە الله ڕێگەی پێ نەداوە، جا ئاگاداری کردوینەتەوە لەوەی کە وەکو ئەوان بین، وە ڕای گەیاندووە کە نەهی لێکردوون لەوەی کە قسە لەسەر الله بکەن مەگەر بە حەق نەبێ، وە بە هەمان شت نەهی لە ئێمەش کردووە، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ﴾ [الشورى : ٢١]، جا رسول الله ﷺ شەریعەتەکانی داناوە، و سوننەتەکانیشی داناوە بە ئیزن و وەحی پەروەردگاری، نەك لە نەفسی خۆیەوە، وە الله ش شاهێدی بۆ

ئەمە داوە هەروەکو فەرموویەتی : ﴿مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى (٢) وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤)﴾ [النجم]، وە فەرموویەتی : ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ﴾ [النساء : ١٧١]، وە فەرموویەتی : ﴿أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِمْ مِيثَاقُ الْكِتَابِ أَنْ لَا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ﴾ [الأعراف : ١٦٩] .

جا ئاگاداری کردوینەتەوە لەوەی کە وەکو ئەوان بین؛ چونکە ئێمەش کتێبمان بۆ ماوەتەوە هەروەکو ئەوەی کە بۆ ئەوانیش ماوەتەوە، وە خوێندومانە هەروەکو ئەوەی ئەوان خوێندویانە .

پاشان پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە ڕێبازی ئەوان دەگرینە بەر، و شوێنی ئاسەواری ئەوان دەکەوین، وە هەندێکمان بیدعە دەکەین وەکو چۆن ئەوان کردیان :

**٣٥** - فەرموویەتی ﷺ : (دەچنە سەر ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان - واتە یەهود و نەصارا - ) .

**٣٦** - وە فەرموویەتی ﷺ : (ئەوەی زۆترین ترسم لێی هەیە بۆ ئوممەتەکەم بریتیە لە : ئەستێرەکان - واتە ئەستێرەناسی و پشت بەستن پێیان - ، وە بە درۆ خستنەوەی قەدەر، و پێشەوا گومڕاکان) .

**٣٧** - وە اللە تعالى پێغەمبەرەکەی ﷺ بەری کردووە لەوانەی کە ﴿**الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ**﴾ [**الأنعام : ١٥٩**]، وە فەرمانی کردووە بە شوێنکەوتنی ڕێگاکەی لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، بەم شێوەیە هەواڵە دەماودەمەکان لە رسول اللە ـوە ﷺ هاتوون، وە هەندێکیمان باس کرد، و باسی هەندێکی تریش دەکەین لەوەی کە پێی دەگەین ان شاء اللە .

**٣٨** - لە ابي واقد الليثي ـوە رضي اللە عنە فەرمووی : رسول اللە ﷺ کە چوو بۆ حونەین بە لای دارێکدا تێپەڕی کە - پێشتر - موشریکەکان چەك و کەل و پەلەکانیان پێدا هەڵدەواسی، پێی دەوترا : درەختە پیا هەڵواسراوەکە، بۆیە وتیان : یا رسول اللە ﷺ، درەختێکی پیاهەڵواسراومان بۆ دیاری بکە هەروەکو چۆن ئەوان درەختێکی پیاهەڵواسراویان هەیە، فەرمووی : (اللە أكبر! ئەمە هەمان شت بوو کە قەومەکەی موسا عليه السلام بە موسایان وت : ﴿**اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ**﴾ [**الأعراف : ١٣٨**]، ئێوە دەچنە سەر ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان) .

**٣٩** - لە ابي واقد الليثي ـوە فەرمووی : لەگەڵ رسول اللە ﷺ دەرچووین بەرەو حونەین، جا بە لای درەختێکدا تێپەڕین، وتم : یا رسول اللە ﷺ ، ئەوەمان بۆ بکە بە درەختێکی پیا هەڵواسراو، هەروەکو چۆن کافرەکان درەختێکی

پیاهەڵواسراویان هەیە، ئەوسا کافرەکان درەختێکیان هەبوو چەکەکانیان پێدا هەڵدەواسی و بە دەوری دا دەمانەوە .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (وتتان هەروەکو ئەوان وتیان : ﴿اجْعَلْ لَنَا إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ [الأعراف : ١٣٨] ئێوە دەچنە سەر رێبازی ئەوانەی پێش خۆتان) .

**٤٠** - لە ابي واقد الليثي ـەوە فەرمووی : لەگەڵ رسول الله ﷺ دەرچووین بەرەو حونەین لە کاتێکدا ئێمە تازە موسڵمان بوبوین، فەرمووی : وە کافرەکان درەختێکیان هەبوو و لە لای دەمانەوە و چەکەکانیان پێدا هەڵدەواسی، پێی دەوترا : درەختە پیا هەڵواسراوەکە، فەرمووی : ئێمەش بە لای درەختێکدا تێپەڕین، و وتمان : یا رسول الله ﷺ ئەوەمان بۆ بکە بە درەختێکی پیاهەڵواسراو، رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەمە رێبازەکانە، الله أكبر! سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ئەوەتان وت کە نەوەکانی ئیسرائیل بە موسایان وت : ﴿اجْعَلْ لَنَا إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ [الأعراف : ١٣٨] ئێوە دەچنە سەر رێبازی ئەوانەی پێش خۆتان) .

**٤١** - لە ابي واقد الليثي ـەوە فەرمووی : کە لە مەککەوە لەگەڵ رسول الله ﷺ دەرچووین بەرەو حونەین، وە کافرەکان درەختێکیان هەبوو لە لای دەمانەوە و چەکەکانیان پێدا هەڵدەواسی، پێی دەوترا : درەختە پیا

هەڵواسراوەکە، فەرمووی : ئێمەش بە لای درەختێکی سەوزی گەورەدا تێپەڕین، فەرمووی : یا رسول الله ﷺ ئەوەمان بۆ بکە بە درەختێکی پیاهەڵواسراو هەروەکو چۆن ئەوان درەختێکی پیاهەڵواسراویان هەیە، رسول الله ﷺ فەرمووی : (سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ئەوەتان وت کە قەومەکەی موسا وتیان : ﴿اجْعَل لَّنَا إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ ۚ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ [**الأعراف** : ١٣٨] ئەوە ڕێبازەکانە، ئێوە دەچنە سەر ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان) .

**٤٢** - لە ابي سعيد الخدري ەوە رضي الله عنه : رسول الله ﷺ فەرمووی : (شوێنی ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، بست بە بست، و قۆڵ بە قۆڵ، هەتا ئەوەی ئەگەر بچنە کونی بزن مژۆکەوە ئەوا ئێوەش دەچن)

وتمان : یا رسول الله ﷺ، یەهود و نەصارا؟ - واتە مەبەستت شوێنکەوتنی ئەوانە - .

فەرمووی : (ئەی کێ؟) .

**٤٣** - کثير بن عبدالله لە باوکیەوە لە باپیریەوە، وتی : لە کاتێکدا رسول الله ﷺ لە مزگەوتەکەیدا بوو وە ماوەلانی لە چواردەوری بوون، جبريل بە وەحیەوە هات، جا بە عەباکەی خۆی داپۆشی، و بۆ ماوەیەکی درێژ مایەوە تاکو ئەو حاڵەتەی نەما، پاشان عەباکەی لابرد، زۆر بە توندی عەرەقەی دەکرد، و

شتێکیشی لە مشتیدا گرتبوو، رسول اللە ﷺ فەرمووی : (ئایا هەموو ئەوەی کە لە دارخورما دەردەچێ دەیزانن؟)، پشتیوانان وتیان : ئێمە هەموو ئەوە دەزانین کە لە دارخورما دەردەچێ، جا دەستی کردەوە و فەرمووی : (ئەمە چییە؟)، وتیان : یا رسول اللە ﷺ تۆوە، فەرمووی : (تۆوی کام شت؟)، وتیان : تۆوی ساڵەکە، فەرمووی : (ڕاستتان کرد، جبریل هات بۆ لاتان بۆ ئەوەی بەڵێنتان لەسەر دینەکەتان لێ وەربگرێ، ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەگرنە بەر، قەیتانی پێڵاو بە پێڵاو - ئەم دەستەواژەیە بۆ دوو شتی هاوشێوە بەکارهاتووە - ، وە هاوشێوەی ئەوەی ئەوان وەردەگرن، ئەگەر بست بوو بە بست، وە ئەگەر قۆڵ بوو بە قۆڵ، وە ئەگەر باع بوو بە باع - باع ماوەی نێوان هەردوو دەستی مرۆڤە - هەتاکو ئەگەر چوونە کونی بزن مژەوە ئێوەش دەچنە ناوی) .

٤٤ - رسول اللە ﷺ فەرمووی : (دەچنە سەر ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان، بست بە بست، و قۆڵ بە قۆڵ، و باع بە باع، هەتاکو ئەگەر بچنە کونی بزن مژەوە ئەوا ئێوەش دەچن، وە هەتاکو ئەگەر یەکێك لەوان بە شێوەیەك جووت بێ لەگەڵ دایکی خۆیدا ئەوا ئێوەش دەیکەنەوە) .

٤٥ - رسول اللە ﷺ فەرمووی : (شوێنی ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، باع بە باع، و قۆڵ بە قۆڵ، و بست بە بست، هەتاکو ئەگەر بچنە کونی بزن مژەوە ئەوا لەگەڵیان دەچن) .

وتيان : ئەی پێغەمبەری الله ﷺ : یەهود و نەصارا؟

فەرمووی : (ئەی کێ؟) .

**٤٦** - لە ابو هريرة وە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە هەمان شێوە، فەرمووی : (ئینجا ئەی کێ؟) .

**٤٧** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (قیامەت بەرپا نابێ هەتاکو ئوممەتەکەم ئەوە وەرنەگرێ کە ئوممەتان و سەردەمانی پێش خۆی وەریان گرتووە، بست بە بست، و قۆڵ بە قۆڵ) .

پیاوێك وتی : یا رسول الله ﷺ ، هەروەکو ئەوەی فارس و ڕۆم کردیان؟

رسول الله ﷺ فەرمووی : (مەگەر خەڵکی هەر ئەوان نین؟) .

**٤٨** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە شوێن ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، بست بە بست، و قۆڵ بە قۆڵ، هەتاکو ئەگەر بچنە کونی بزن مژەوە ئەوا ئێوەش دەچن) .

**٤٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە شوێن ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، بست بە بست، و قۆڵ بە قۆڵ، هەتاکو ئەگەر بچنە کونی بزن مژەوە ئەوا ئێوەش دەچن) .

وتيان : يا رسول الله ﷺ، يەهود و نەصارا؟

فەرمووى : (ئەى كێ جگە لەوان؟) .

**٥٠** - رسول الله ﷺ فەرمووى : (خراپترینى ئەم ئوممەتە دەچنە سەر ڕێبازى ئەوانەى پێش خۆیان لە ئەهلى كتاب بە قەیتانى پێڵاو بە پێڵاو) .

**٥١** - أبو عامر الهوزني وتى : حەجم كرد لەگەڵ معاوية دا رضي الله عنه، كە گەیشتە مەككە هەوڵى پێدرا كە چیرۆك خوێنێكى تێدایە شتانێك باس دەكات كە ئینكارى لێ دەكرێ، بۆیە معاوية ناردى بە شوێنیدا و فەرمووى : بەمە فەرمانت پێكراوە؟

وتى : نەخێر .

فەرمووى : ئەى چى واى لێكردیت بیكەیت؟

وتى : زانستێكە و بڵاوى دەكەینەوە .

معاوية پێى فەرموو : ئەگەر خۆم پێت بگەشتمایە ئاوام لێ دەكردیت، بڕۆ دەرەوە، و نەبیستم كە شتێكت باس كردبێ .

جا كە نوێژى نیوەڕۆى كرد چووە سەر مینبەرەكە و سوپاس و ستایشى الله ى كرد، پاشان فەرمووى : ئەى گرۆى عەرەب، والله ئەگەر ئێوە هەڵنەستن بەوەى كە پێغەمبەرەكەتان ﷺ پێى هاتووە ئەوا غەیرى ئێوە لە خەڵكى - واتە

غەیرە عەرەب - ئەولاترە کە پێی مەڵنەستێ، ڕۆژێك رسول الله ﷺ مەستا لە ناوماندا و فەرمووی : (ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون لە ئەهلی کتاب دابەش بوون بۆ سەر حەفتا و دوو ڕێباز واتە ئارەزوو، وە ئەم ئوممەتە دابەش دەبێ بۆ سەر حەفتا و سێ ڕێباز واتە ئارەزوو، حەفتا و دوویان لە ئاگردان، وە یەك دانەیان لە بەهەشتدایە کە ئەویش جەماعەتە، بۆیە دەستی پێوە بگرن، بۆیە دەستی پێوە بگرن) .

**٥٢** - ابو عامر عبدالله بن لحي وتی : حەجمان کرد لەگەڵ معاوية بن ابي سفيان دا رضي الله عنهما، کە گەشتینە مەککە مەوالْی پێدرا بە پیاوێك کە چیرۆك بۆ ئەهلی مەککە دەخوێنێتەوە، بۆیە معاوية ناردی بە شوێنیدا و فەرمووی : بەم چیرۆکانە فەرمانت پێکراوە؟

وتی : نەخێر .

فەرمووی : ئەی چی وای لێکردیت کە بە بێ ئیزن چیرۆك بخوێنیتەوە؟

وتی : زانستێك بڵاو دەکەینەوە کە الله فێری کردووین .

وتی : ئەگەر پێت بگەشتمایە لە پێش ئەم جارەمەوە ئەوا دەمکرد .

پاشان کە نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد مەستا و فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەهلی کتاب لە دینەکەیان دابەش بوون بۆ سەر حەفتا و دوو ڕێباز، وە ئەم ئوممەتە دابەش دەبێ بۆ سەر حەفتا و سێ ڕێباز واتە ئارەزوو

هەموویان لە ئاگردان جگە لە یەك دانە، کە ئەویش جەماعەتە، واللە ئەی گرۆی عەرەب، ئەگەر هەڵنەستن بەوەی پێغەمبەرەکەتان ﷺ پێی هاتووە ئەوا غەیری ئێوە لە خەڵکی ئەولاترە کە پێی هەڵنەستێ) .

**٥٣** - أبی سعید الخدري رضي الله عنه فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (لە ئوممەتەکەمدا جیاوازی و تاقم دروست دەبن، قەومێکیان قسەکانیان باشە و کردەوەکانیان خراپە، قورئان دەخوێننەوە و لە قورگیان ناچێتە خوارەوە، هەندێکتان نوێژەکەی خۆتان پێ کەمە لە چاو نوێژی ئەوان، وە ڕۆژووەکەشتان پێ کەمە لە چاو ڕۆژووی ئەوان، ئەوان لە دین دەردەچن هەروەکو چۆن تیر لە کەوان دەردەچێ، پاشان ناگەڕێنەوە هەتاکو نەچێتەوە سەری، ئەوان خراپترینی دروستکراوەکانن بە مرۆڤ و ئاژەڵانیشەوە، خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کە دەیان کوژێ یان ئەوان دەیکوژن، بانگەواز بۆ کتێبی اللە دەکەن لە کاتێکدا هیچ پەیوەندیشیان پێوەی نیە، هەر کەس شەڕی لەگەڵیان کرد ئەوا ئەولاترە بە اللە لەوان)

وتیان : یا رسول الله ﷺ، نیشانەیان چییە؟

فەرمووی : (سەرتاشینە - واتە سەر سفرکردن - ).

**٥٤** - یزید الرقاشي وتی : أنس بن مالك رضي الله عنه بۆی باسکردم و فەرمووی : لای رسول الله ﷺ باسی پیاوێك کرا، باسی هێزی پیاوەکەیان کرد لە

کاتی ئیشدا، وه تێکۆشانی له کاتی پەرستشدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئەوه یەکەم کەسە له ئوممەتەکەم دەرچووه، ئەگەر بیکوژیت ئەوا له دوای من دوو پیاو له ئوممەتەکەم جیاوازیان تێ ناکەوێ، نەوەکانی ئیسرائیل دابەش بوون بۆ سەر حەفتا و یەك تاقم، وه ئوممەتەکەی من دابەش دەبێ بۆ سەر حەفتا و دوو تاقم، هەموویان له ئاگردان جگه له یەك دانه) .

يزيد الرقاشي وتی : ئەویش جەماعەته .

**٥٥** - ابن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : چوومه ژوورەوه بۆ لای رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەی ابن مسعود) .

وتم : له خزمەتدام و ڕووم له تۆیه یا رسول الله ﷺ .

فەرمووی : (ئایا دەزانی کێ زاناترینی خەڵکییه؟) .

وتم : الله و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن .

فەرمووی : (زاناترینی خەڵکی بەرچاو ڕوونترینیانه به حەق کاتێك که خەڵکی جیاوازیان تێکەوت، تەنانەت ئەگەر کەمتەرخەمیش بێ له کردەوه کردندا، ئەوانەی له پێش منەوه بوون جیاواز بوون و دابەش بوون بۆ حەفتا و دوو تاقم، سێ دانەیان ڕزگاری بوو، و ما باقی له ناوچوون، تاقمێکیان بەرەنگاری پاشاکان بوونەوه، و جەنگیان لەگەڵ کردن لەسەر دینەکەیان و دینی عیسی

عليه السلام، وە گرتنیان و بە مشار بڕینیانەوە، وە تاقمێکیان توانای بەرەنگار بوونەوەی پاشاکانیان نەبوو، وە توانای ئەوەشیان نەبوو لە نێوانیاندا بمێننەوە و بانگیان بکەن بۆ دینی اللە و دینی عیسی بن مریم، بۆیە بە زەویدا ڕۆشتن و گەڕان و گۆشەگیری و خەڵوەتگیریان گرتە بەر، ئەوان ئەو کەسانەن کە اللە دەربارەیان فەرموویەتی : ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾ تاکو فەرمایشتی ﴿فَٰسِقُونَ﴾ [**الحديد : ٢٧**]، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (هەر کەسێك ئیمانی پێ هێنام و بە ڕاستی دانام و شوێنم کەوت، ئەوا حەقی بەرپرسیارێتیەکەی خۆی گەیاندووە، وە هەر کەس شوێنم نەکەوت ئەوا ئەو کەسانە لە ناوچووەکانن) .

**٥٦** - أبو غالب وتی : لای ابي أسامة رضي اللە عنه بووم، پیاوێك وتی : ئایا فەرمایشتی اللە ـت بینیوە : ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ﴾ [**آل عمران : ٧**]، ئەوانە کێن؟

فەرمووی : ئەوانە خەواریجەکانن، پاشان فەرمووی : دەست بگرە بە سواد الأعظم ـەوە .

وتم : دەزانی کە چیان هەیە .

فەرمووی : ئەوەی کردویانە لەسەر شانی خۆیانە، و ئەوەشی ئێوە دەیکەن لەسەر شانی خۆتانە، وە گوێڕایەڵ بن هیدایەت دەدرێن .

پاشان فەرمووی : نەوەکانی ئیسرائیل دابەش بوون بۆ سەر حەفتا و یەك تاقم، هەموویان لە ئاگردان، ئەم ئوممەتەش تاقمێك لەوان زیاتری هەیە کە ئەوەیان لە بەهەشتدایە، ئەمەش فەرمایشتی الله یە : ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ﴾ [**آل عمران : ١٠٦**] خوێندیەوە هەتاکو فەرمایشتی : ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ [**آل عمران : ١٠٧**]، وتم : ئەوان کێن ؟

فەرمووی : خەواریجەکانن .

وتم : ئەمەت لە رسول الله ﷺ گوێ لێبوو ؟

فەرمووی : لە رسول الله ﷺ گوێم لێبوو .

**٥٧** - داود بن ابی الفرات بۆی باس کردین، کە ابو غالب بۆی باسکردووە کە ابي أمامة رضي الله عنه پێی فەرمووە : نەوەکانی ئیسرائیل دابەش بوون بۆ سەر حەفتا و یەك تاقم، وە ئەم ئوممەتەش یەك تاقم لەوان زیاتر دەبێ، هەموویان لە ئاگردان، تەنیا سواد الأعظم نەبێ، کە ئەویش جەماعەتە .

وتم : دەزانی کە چی لە سواد الأعظم هەیە، ئەویش لە سەردەمی جێنشینایەتی عبدالملك بن مروان .

فەرمووی : والله منیش ئینکاری کرەوەکانیان دەکەم، بەڵام ئەوەی کردویانە لەسەر شانی خۆیانە، و ئەوەشی ئێوە دەیکەن لەسەر شانی خۆتانە، وە بیستن و گوێڕایەڵی باشترە لە تاوان و سەرپێچی .

: سواد الأعظم له ڕووی زمانەوانیەوە واتە ڕەشاییە گەورەکە یان زۆرەکە، بەڵام له شەرعدا جیاوازی له واتاکەی هەیە؛ وەکو حەق و ئەهلەکەی، جەماعەت، والله اعلم .

**٥٨** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (نەوەکانی ئیسرائیل دابەش بوون بۆ حەفتا و یەك ڕێباز، جا نە شەوەکان دەڕۆن نە ڕۆژەکانیش هەتاکو ئوممەتەکەی منیش وەکو ئەوی لێ نەیەت، یاخود فەرمووی : نمونەی ئەوی لێ نەیەت، وە هەموو تاقمێکیش لە ئاگردان، جگە لە یەك دانە کە ئەویش جەماعەتە) .

**٥٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (یەهود دابەش بوون بۆ حەفتا و یەك تاقم، یان حەفتا و دوو تاقم، وە نەصاراش بە هەمان شێوەی ئەوان، وە ئەم ئوممەتەش دابەش دەبێ بۆ حەفتا و سێ تاقم) .

**٦٠** - عبدالله بن عمرو رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەوەی بەسەر نەوەکانی ئیسرائیل هات بەسەر ئوممەتی منیشدا دێت، نمونە بە نمونە، قەیتانی پێڵاو بە پێڵاو، ئەوان دابەش بوون بۆ حەفتا و دوو ڕێباز، وە ئەم ئوممەتەش دابەش دەبێ بۆ حەفتا و سێ ڕێباز، هەموویان لە ئاگردان جگە لە یەك دانەیان) .

وتیان : یا رسول الله ﷺ، ئەو دانەیەیان چییە؟

فەرمووی : (ئەوەیە کە ئەمڕۆ من و هاوەڵانم لەسەرین) .

٦١ - له ابي الصهباء البكري وه، وتی : گوێم له علي بن ابي طالب رضي الله عنه بوو، كه بانگی رأس الجالوت و أسقف النصاری ی كرد، و فه‌رمووی : من پرسیارتان له باره‌ی شتێكه‌وه لێ ده‌كه‌م، له كاتێكدا له هه‌ردووكتان زاناترم پێی، بۆیه لێمی مه‌شارنه‌وه، ئه‌ی رأس الجالوت، سوێندت ده‌ده‌م به‌و الله یه‌ی كه ته‌وراتی بۆ موسی علیه السلام دابه‌زاند و گه‌زۆ و باڵنده‌ی سه‌لوای ده‌رخوارد دان، وه ڕێگه‌یه‌كی له ناو ده‌ریادا بۆ كردنه‌وه، و له به‌رده‌كه دوانزه كانیاوی بۆ هه‌ڵقوڵاندن، كه بۆ هه‌ر هۆزێك له نه‌وه‌كانی ئیسرائیل كانیه‌ك هه‌بوو، جگه له‌وه پێت نه‌وتم : نه‌وه‌كانی ئیسرائیل له دوای موسی دابه‌ش بوون بۆ چه‌ند تاقم؟

پێی وت : ته‌نانه‌ت بۆ یه‌ك تاقمیش دابه‌ش نه‌بوون .

علي سێ جار پێی فه‌رموو : درۆت كرد؛ سوێند به‌و الله یه‌ی كه هیچ خوایه‌ك نییه شایه‌نی په‌رستن بێ جگه له ئه‌و، نه‌وه‌كانی ئیسرائیل دابه‌ش بوون بۆ حه‌فتا و یه‌ك تاقم، هه‌موویان له ئاگردان جگه له یه‌ك تاقم .

پاشان بانگی الأسقف ی كرد و فه‌رمووی : سوێندت ده‌ده‌م به‌و الله یه‌ی كه ئینجیلی دابه‌زاند بۆ عیسی علیه السلام، وه گه‌شت كردنه‌كه‌ی كرد به به‌ره‌كه‌ت، و په‌ندی نیشانتان دا، به‌وه‌ی كه كوێری زكماكی چاك كرده‌وه و مردووی زیندوو كرده‌وه، وه له قوڕ باڵنده‌ی بۆتان دروست كرد، وه پێتانی

ڕاگەیاند كە چی دەخۆن و چی هەڵدەگرن لە ماڵەكانتان، جگە لەمە وتی : بە ڕاستت دەخەمەوە ئەی پێشەوای بڕواداران .

فەرمووی : نەصارا دابەش بوون بۆ چەند تاقم لە دوای عیسی؟

وتی : نا واللّٰه تەنانەت بۆ یەك تاقمیش دابەش نەبوون .

بۆیە علي سێ جار پێی فەرموو : درۆت كرد؛ سوێند بەو اللّٰه یەی كە هیچ خوایەك نییە شایەنی پەرستن بێ جگە لە ئەو، دابەش بوون بۆ حەفتا و دوو تاقم، هەموویان لە ئاگردان جگە لە یەك تاقم، ئەمما تۆ ئەی یەهودی؛ اللّٰه دەفەرموێ : ﴿وَمِن قَوْمِ مُوسَى أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ﴾ [**الأعراف : ١٥٩**] جا ئەوەی كە ڕزگاری دەبێ ئەمەیانە، وە تۆ ئەی نەصرانی؛ اللّٰه دەفەرموێ : ﴿مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَاءَ مَا يَعْمَلُونَ﴾ [**المائدة : ٦٦**] جا ئەوەی كە ڕزگاری دەبێ ئەمەیانە، بەڵام بۆ ئێمە دەفەرموێ : ﴿وَمِمَّنْ خَلَقْنَا أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ﴾ [**الأعراف : ١٨١**] جا ئەوەی لەم ئوممەتە ڕزگاری دەبێ ئەمەیە .

**٦٢** - أبو عمر وتی : علي پێمی فەرموو : ئەی ابو عمر، دەزانی یەهود دابەش بوو بۆ چەند تاقم؟

وتی : وتم : اللّٰه و پێغەمبەرەكەی زاناترن .

فەرمووی : دابەش بوو بۆ حەفتا و یەك تاقم، هەموویان لە الهاوية ن - بەشێكە لە ئاگری دۆزەخ - جگە لە دانەیەكیان، كە ڕزگاربووە، وە نەصارا دابەش

بوو بۆ حەفتا و دوو تاقم، هەموویان لە الهاویة ن جگە لە دانەیەکیان کە ڕزگاربووە، ئەی ابو عمر، دەزانی ئەم ئوممەتە دابەش دەبێ بۆ چەند تاقم؟

وتم : اللّٰه و پێغەمبەرەکەی زاناترن .

فەرمووی : دابەش دەبێ بۆ حەفتا و سێ تاقم، هەموویان لە الهاویة ن، جگە لە دانەیەکیان، کە ڕزگاربووە .

پاشان علي فەرمووی : دەزانی کە چەند تاقم لەبەر من دروست دەبن؟

وتم : لەبەر تۆش تاقم دروست دەبن ئەی پێشەوای بڕواداران؟

فەرمووی : بەڵێ؛ دوانزە تاقم، هەموویان لە الهاویة ن، جگە لە دانەیەکیان کە ڕزگاربووە، وە ئەویش ئەو دانەیەیە .

واتە ئەو دانەیەی لە حەفتا و سێ تاقمەکە ڕزگاری دەبێ، تۆش لەوانیت ئەی ابو عمر .

**٦٣** - ابي عطاء اليحبوري وتی : عبادة بن الصامت رضي الله عنه فەرمووی : ئەی ابو عطاء، چی دەکەن ئەگەر قورئان خوێن و زاناکانتان هەڵبێن تا دەگەنە لوتکەی چیاکان و لەگەڵ ئاژەڵانی کێویدا بن؟

وتی : وتم : جا بۆ وا دەکەن؟

فەرمووی : لە ترسی ئەوەی کە بیان کوژن .

وتی : وتم : سبحان الله! ئایا دەیانکوژین لە کاتێکدا کتێبی الله لە ناوماندایە و دەیخوێنینەوە؟

فەرمووی : دایکی ابو عطاء شین و ڕۆڕۆی بۆ بکا! مەگەر یەهود تەوراتیان پێ نەدرا پاشان گومڕا بوون لێی و وازیان لێهێنا؟ مەگەر نەصارا ئینجیلیان پێ نەدرا و پاشان گومڕا بوون لێی و وازیان لێهێنا؟ ئەمانە چەند ڕێبازێکن هەندێکیان شوێنی هەندێکی تریان دەکەون، واللە هیچ شتێك لە پێش ئێوەوە نەبووە ئیللا لە ناو ئێوەشدا ڕوودەدات .

**٦٤** - يحيى بن عبيد وتی : گوێم لە پیاوێك لە ئازاترین هاوەڵانی عبدالله بن مسعود بوو، وتی : عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : ئێوە لە هەموو کەس زیاتر لە نەوەکانی ئیسراِئیل دەچن، واللە بانگەشەی هیچ شتێك ناکەن کە کردبێتیان ئیللا ئێوەش کردووتانە، وە هیچ شتێك لە ناو ئەواندا نەبووە ئیللا هەمان شت لە ناو ئێوەش دەبێت .

پیاوێك وتی : ئایا هەمان شتی قەومی لوط عليه السلام لە ناو ئێمەش دەبێ؟

فەرمووی : بەڵێ، لە ناو ئەوانە دەبێ کە موسڵمان بوون و نەسەبی خۆشیان دەزانن .

**٦٥** - الهزيل وتی : عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : ئەوانەی لە هەموو خەڵکی زیاتر سەر و سیمایان بە نەوەکانی ئیسرائیل دەچێت ئێوەن، شوێنی ئاسەواریان دەکەون قەیتانی پێڵاو بە پێڵاو، هیچ شتێك لە ناو ئەوان ڕوو نادات ئیللا هەمان شت لە ناو ئێوەش ڕوودەدات .

**٦٦** - همام بن الحارث وتی : لای حذیفة بووین رضي الله عنه، باسی فەرمایشتی : ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ [**المائدة : ٤٤**] کرا، پیاوێکیش لە خەڵکەکە وتی : ئەمە دەربارەی نەوەکانی ئیسرائیلە .

حذیفة ش فەرمووی : بەڵێ برایان نەوەکانی ئیسرائیل بۆ ئێوەیە، دەکرێ شیرینەکان بۆ ئێوە بێت و تاڵەکانیش بۆ ئەوان! نەخێر سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ڕێبازتان دەبێ بە ڕێبازی ئەوان قەیتانی پێڵاو بە پێڵاو .

**٦٧** - عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما دەیفەرموو : دەچنە سەر ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان بە شیرین و تاڵییەوە .

**٦٨** - ابن عباس رضي الله عنه فەرمووی : هیچ شتێك لە ناو نەوەکانی ئیسرائیل ڕووی نەداوە ئیللا لە ناو ئێوەشدا ڕوودەدات .

**٦٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (خەڵکینە گوێ لە قسەکانم بگرن، چونکە من نازانم لەوانەیە لەمڕۆ بەدواوە نەتانبینمەوە لەم شوێنەدا، خەڵکینە، خوێنتان و ماڵ و سامانتان لەسەر یەکتر حەرامە تاکو ئەو ڕۆژەی دەگەنەوە بە

پەروەردگارتان، هەر وەکو حەرامی ئەم ڕۆژەتان لەم شارەتاندا، وە ئێوە دەگەنەوە بە پەروەردگارتان و سەبارەت بە کردەوەکانتان لێتان دەپرسێتەوە، وە منیش گەیاندم) .

جا قسەی زۆر کرد و لە کۆتاییدا فەرمووی : (بۆیە خەڵکینە لە قسەکانم تێبگەن، چونکە من گەیاندم، وە خەڵکینە من شتێکم بۆتان بەجێ هێشتووە ئەگەر ئێوە پشتی پێ ببەستن هەرگیز گومڕا نابن : ئەویش کتێبی اللّٰه و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی . خەڵکینە، گوێ بۆ ئەوە بگرن کە پێتانی دەڵێم، تێبگەن دەژین، وە دواى من کافر مەبنەوە هەندێکتان بە شمشێر لە ملی هەندێکی ترتان بدا، یا اللّٰه گەیاندم؟ یا اللّٰه گەیاندم؟ یا اللّٰه گەیاندم؟)

---

: پێغەمبەر ﷺ ئەم وتارەی لە حەجی ماڵئاواییدا داوە، کە مانگی ذي الحجة یەکێکە لە مانگە حەرام کراوەکان، هەروەها کە دەفەرموێ کافر مەبنەوە لێرەدا سەلەف لە بیروباوەڕەکانیاندا باسیان کردووە کە مەبەست پێی کوفری گەورە نیە بەڵکو کوفری بچوکە .

٧٠ - عرباض بن سارية رضي اللّٰه عنه فەرمووی : رسول اللّٰه ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین، پاشان ڕووی تێکردین و ئامۆژگاری کردین بە ئامۆژگاریەکی ڕوون کە چاوەکانی دەهێنایە فرمێسك، و دڵەکانی دەهێنایە لەرزین، جا قسەکەرێك وتی : یا رسول اللّٰه ﷺ، دەڵێی ئەمە ئامۆژگاری ماڵئاواییە، فەرمووی

: (وەسیەتتان بۆ دەکەم بە ترسان لە اللە، و بیستن و گوێڕایەڵی، تەنانەت ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی گوێ و لوت و لێو قرتاویش بوو، چونکە هەر کەس لە ئێوە بژی ئەوا جیاوازیەکی زۆر دەبینێ، جا دەست بگرن بە سوننەتی من و جێنشینە ڕاشدینە ڕێنمونیکراوەکانەوە لە دوای من، قەپی پێدا بکەن بە شەویلگەکانتان، وە ئاگاداری کاروبارە داهێنراوەکان بن، چونکە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە) .

**٧١** - عبدالرحمن بن عمرو السلمي و حجر بن حجر الكلاعي وتیان : چووینە ژوورەوە بۆ لای عرباض بن سارية کە ئەو کەسە بوو فەرمایشتی : ﴿ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ﴾ [**التوبة : ٩٢**] لەبارەوە دابەزی، وە ئەو لەو کاتەدا نەخۆش بوو، وتمان : هاتووین سەردانت بکەین و بەسەرت بکەینەوە وە سوودت لێ وەربگرین .

فەرمووی : رسول اللە ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین، پاشان ڕووی تێکردین و ئامۆژگاری کردین بە ئامۆژگاریەکی ڕوون کە چاوەکانی دەهێنایە فرمێسك، و دڵەکانی دەهێنایە لەرزین، جا قسەکەرێك وتی : یا رسول اللە ﷺ، ئەمە ئامۆژگاری ماڵئاواییە، کەواتە پەیمانی چیمان لێ وەردەگری؟

فەرمووی : (وەسیەتتان بۆ دەکەم بە ترسان لە اللە، وە بیستن و گوێڕایەڵی، تەنانەت ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی، چونکە هەر کەس لە ئێوە لە دوای من بژی ئەوا جیاوازیەکی زۆر دەبینێ، جا دەست بگرن بە سوننەتی من و جێنشینە

ڕاشدینە ڕێنمونیکراوەکانەوە، قەپی پێدا بکەن بە شەویلگەکانتان، وە ئاگاداری کاروبارە داهێنراوەکان بن، چونکە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە) .

**٧٢** - یحیی بن أبي المطاع هەمان شتی بۆ باسکردین لە عرباض بن ساریة وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ .

**٧٣** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (دەست بگرن بە سوننەتی من و جێنشینە ڕاشدینە ڕێنمونیکراوەکانەوە، قەپی پێدا بکەن بە شەویلگەکانتان) .

**٧٤** - جابر بن عبدالله رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ ئەگەر لە وتارەکەی ببوایەتەوە دەیفەرموو : (باشترین فەرموودە کتێبی الله یە، وە باشترین ڕێنمونی ڕێنمونی محمد ە ﷺ، وە خراپترینی کاروبارەکان داهێنراوەکانیەتی) .

**٧٥** - جابر بن عبدالله دەیفەرموو : وتاری پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژانی جومعەدا بوو، سوپاس و ستایشی الله ی دەکرد، وە بە دوایدا دەیفەرموو : (باشترین فەرموودە کتێبی الله یە، وە باشترین ڕێنمونی ڕێنمونی محمد ە ﷺ، وە خراپترینی کاروبارەکان داهێنراوەکانیەتی، وە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە) .

**٧٦** - عمر رضي الله عنه دەیفەرموو : باشترین وتە وتەی الله یە، وە باشترین ڕێنمونی ڕێنمونی محمد ە ﷺ، وە خراپترینی کاروبارەکان داهێنراوەکانیەتی .

**٧٧** - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : باشترین فەرموودە کتێبی الله یە، وە باشترین ڕێنمونی ڕێنمونی محمد ە ﷺ، وە خراپترینی کاروبارەکان داهێنراوەکانیەتی، ئەوەی بەڵێنتان پێی دراوە دێت، و ئێوەش توانای وەستاندنیتان نییە، وە ئەوەی دوورە ئەوەیە کە نایەت . دەست بگرن بە ڕاستگۆییەوە، چونکە بەرەو چاکە ڕێنمونی دەکا، وە چاکەش بەرەو بەهەشت ڕێنمونی دەکات، وە پیاو بەردەوام ڕاست دەکات هەتاوەکو وای لێدێ لە لای الله ناوی بە ڕاستگۆ دەنوسرێ، وە چاکە لە دڵیدا جێگیر دەبێ، جا لە دڵیدا هێندەی کونە دەرزییەك شوێن نامێنێ بۆ خراپە تاکو تیای نیشتەجێ بێ . وە ئاگاداری درۆ بن، چونکە ڕێنمونی دەکات بەرەو خراپە، وە خراپەش ڕێنمونی دەکات بەرەو ئاگر، وە پیاو بەردەوام درۆ دەکات تاکو وای لێدێ لە لای الله ناوی بە درۆزن دەنوسرێ، وە خراپە لە دڵیدا جێگیر دەبێ، تا ئەوەی بە ئەندازەی کونە دەرزییەك شوێن لە دڵیدا نەمێنێ بۆ چاکە تاکو تیای نیشتەجێ بێ .

**٧٨** - عبدالله بن مسعود فەرمووی : خراپترینی کاروبارەکان داهێنراوەکانیەتی، وە هەموو داهێنراوێکیش بیدعەیە .

**٧٩** - عبدالله بن مسعود فەرمووی : شوێن بکەون و بیدعە مەکەن، بەڕاستی ئەوە بەسە بۆتان، وە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە .

**٨٠** - عبدالله بن مسعود فەرمووی : هەموو داهێنراوێك بیدعەیە، وە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، وە هەموو گومڕاییەك لە ئاگردایە .

**٨١** - ابن مسعود فەرمووی : ئێوە ئەمڕۆ لەسەر فیترەتن، وە ئێوە داهێنان دەکەن و داهێنانیشتان بۆ دەکرێ، جا ئەگەر داهێنراوێکتان بینی ئەوا دەست بگرن بە ڕێنمونی یەکەمەوە - واتە ئەوەی لە پێش بیدعەکەدا هەبووە - .

**٨٢** - عبدالله بن عمر رضي الله عنهما دەیفەرموو : باشترین دین دینی محمد ە ﷺ، وە خراپترینی کاروبارەکان داهێنراوەکانیەتی، شوێن بکەون و بیدعە مەکەن، چونکە گومڕا نابن هەتاوەکو شوێنی ئەثەر بکەون، ئەگەر شوێنمان بکەون ئەوا ئێمە پێشتان کەوتووین بە پێشکەوتنێکی دوور، وە ئەگەر سەرپێچیمان بکەن ئەوا گومڕابوونە بە گومڕابوونێکی زۆر، هیچ ئوممەتێك لە دینەکەیدا بیدعەیەکی دانەهێناوە ئیللا الله سوننەتێکی ڕێنمونیکاری لە ناویاندا بەرز کردۆتەوە، پاشان هەرگیز بۆیان ناگەڕێتەوە، وە ئەگەر ئاگرێك ببینم لە سوچێکی مزگەوتەکەدا سوتاندنەکەی گەشە دەکات لام خۆشترە لەوەی بیدعەیەك ببینم کە هیچ کەس نییە بیگۆڕێت .

**٨٣** - ابن عمر فەرمووی : هەموو بیدعەیەك گومڕاییە تەنانەت ئەگەر خەڵکی بە باشیش بینیان .

**٨٤** - ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : دەست بگرن بە ئیستیقامەوە، لەگەڵ شوێنکەوتنی کاربەدەستان و ئەثەر، وە ئاگاداری بیدعە کردن بن .

**٨٥** - ابن عباس فەرمووی : بوغزاوترین کاروبار لای الله بیدعەیە .

**٨٦** - ابي قلابة وتی : ابن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : دەست بگرن بە عیلمەوە پێش ئەوەی هەڵبگیرێ، وە هەڵگیرانەکەی بریتیە لەوەی کە : هاوەڵەکانی یان ئەهلەکەی نەمێنن، دەست بگرن بە عیلمەوە، چونکە هەر یەك لە ئێوە نازانێت کەی پێویستی پێی دەبێ، یان کەسانی تر پێویستیان بەوە دەبێ کە لای ئەو هەیە، وە ئێوە - لە داهاتوودا - کەسانێك دەبینن لاڤی ئەوە لێدەدەن کە بانگەواز بۆ کتێبی الله دەکەن، کەچی لە پشت خۆیانەوە جێیان هێشتووە، بۆیە دەست بگرن بە عیلمەوە، و ئاگاداری بیدعە کردن بن، وە ئاگاداری ڕۆچوون بن لە قسەدا، وە ئاگاداری قوڵ بوونەوە بن، و دەست بگرن بە کۆنەکەوە .

---

: کۆنەکە واتە ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لەسەری بوون، بەڵام ابي قلابة لە ابن مسعودەوە هیچی نەبیستووە بۆیە سەنەدەکەی پچڕانی تیایە .

**٨٧** - إبراهيم وتی : حذيفة رضي الله عنه فەرمووی : لە الله بترسن ئەی گرۆی قورئان خوێنان، وە ڕێگەی ئەوانەی پێش خۆتان بگرنە بەر، سوێند بە الله ئەگەر ئیستیقامەتان هەبێ ئەوا بە پێشکەوتنێکی دوور پێش دەکەون، وە ئەگەر وازتان لێی هێنا و چەپ و ڕاستتان گرتە بەر ئەوا بە گومڕابوونێکی دوور گومڕابوونە، یاخود فەرمووی : ڕوون .

---

: مەبەست لە ڕێگەی پێش خۆتان هاوەڵانە نەك یەهود و نەصارا .

**٨٨** - همام وتی : ئێمە لە ئەڵقەیەكدا بووین لە مزگەوت و حذیفة بەلاماندا تێپەڕی، فەرمووی : ئەی گرۆی قورئان خوێنان، ڕێگەكە بگرنە بەر، سوێند بە الله ئەگەر گرتتانە بەر ئەوا بە پێشكەوتنێكی دوور پێشكەوتونە، وە ئەگەر ڕاست و چەپتان گرتە بەر ئەوا بە گومڕابوونێكی دوور گومڕابوونە .

**٨٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (كردەوەیەكی كەم لە سوننەتدا باشترە لە كردەوەیەكی زۆر لە بیدعەدا) .

---

: ئەم فەرموودەیە مرسل ە، بەڵام ئەثەری دواتر صحیحە .

**٩٠** - عبدالله بن مسعود فەرمووی : نێوەندگیری لە سوننەتدا باشترە لە تێكۆشان لە بیدعەدا .

**٩١** - عبدالله بن مسعود فەرمووی : كەمی لە سوننەتدا باشترە لە تێكۆشان لە بیدعەدا، وە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە .

**٩٢** - عمر بن عبدالعزيز فەرمووی : ئەگەر بۆ هەر بیدعەیەك كە اللە لەسەر دەستی من لە ناوی دەبا، و بۆ هەر سوننەتێك كە اللە لەسەر دەستی من دەیژیێنێتەوە، پارچە گۆشتێكی بویستایە تاكو دەگەیشتە ئەوەی كۆتا دانەی نەفسی خۆمی پێویست بوایە، ئەوا لە پێناوی اللە دا ئاسان دەبوو .

**٩٣** - یونس بن عبید دەیوت : پێم گەیشتووە كە عمر بن عبدالعزیز دەیفەرموو : ئەگەر هەر سوننەتێكی مردوو كە اللە لەسەر دەستی من بیژیێنێتەوە، و هەر بیدعەیەكی كار پێكراو كە اللە لەسەر دەستی من لە ناوی ببا، پارچەیەك لە گۆشتی منی بویستایە، ئەوا هێشتا كەم دەبوو .

**٩٤** - عبید بن عبدالملك ڕایگەیاند كە عمر بن عبدالعزیز دەیفەرموو : واللە ئەگەر سوننەتێك نەژیێنمەوە، و بیدعەیەك نەمرێنم، ئەوا پێم خۆش نەدەبوو كە دووبارە لە دونیادا بژیمەوە، وە خۆزگەم دەخواست كە هەر كات سوننەتێكم ژیاندەوە و بیدعەیەكم مراند، لەگەڵیدا پارچەیەك لە جەستەم لێببوایەتەوە .

**٩٥** - خارجة بن عبیداللە وتی : عبدالملك بن عمر بن عبدالعزیز لای ئێمە بوو، و ئێمەش ئازار مان دەدا، جا كە باوكی بوو بە خەلیفە چوو بۆ لای كە لەو كاتەدا نۆزدە ساڵ بوو، وە باوكی خەڵكی ڕادەهێنا لەسەر قورئان و سوننەت، و ئەو بڕیارەشی لەسەریان بڕیبۆوە، ئەو بە هەر شێوەیەك كە ویستی لێ بوو فێری دەكردن، جا كە عبدالملك چوو بۆ لای پێی وت : ئەی پێشەوای بڕواداران، ئایا كتێبی اللە و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەڕێ ناكەی؟ واللە باكم پێی نییە ئەگەر

قەدەرەرەکان هەردووکمان بگریٚ، پێی فەرموو : کوڕم، من ڕاهێنان بە خەڵکی دەکەم بە ڕاهێنانێکی سەخت، دەروازەیەك لەسوننەت دەردەهێنم و دەروازەیەك لە تەماع دادەنێم، جا ئەگەر لە سوننەت دوور کەوتنەوە ئەوا دەچنە تەماعەوە، وە ئەگەر پەنجا ساڵ بژیم گومانم وایە هەموو ئەوەی کە دەمەوێت نایگەیەنم، جا ئەگەر ژیام داواکەم دەگەیەنم، وە ئەگەر مردم ئەوا الله زاناترە بە نیەتم .

**٩٦** - بشر بن عبدالله و سوادة بن زياد و عمرو بن مهاجر وتیان : عمر بن عبدالعزيز نامەی بۆ خەڵکی نوسی : کەس بۆی نییە بۆچوونێکی هەبێ لە پاڵ سوننەتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ دایناوە .

**٩٧** - عمر بن عبدالعزيز فەرمووی : لە دوای سوننەت هیچ عوزرێك بۆ هیچ کەس نییە کە لەسەر گومڕایی بێ و وایزانیبێ کە لەسەر هیدایەتە .

**٩٨** - عبدالله بن دينار وتی : عمر بن عبدالعزيز نامەی بۆ خەڵکی مەدینە نوسی : کە تەماشای فەرموودەکانی رسول الله ﷺ بکەن، وە بینوسنەوە، چونکە من دەترسم لە وانەکانی عیلم و نەمانی زانایان .

**٩٩** - لە غطيف بن الحارث الثمالي وە : کە عبدالملك بن مروان پرسیاری لێکرد دەربارەی بەرزکردنەوەی دەست لەسەر مینبەر لەگەڵ چیرۆکەکان، غطيف وتی : ئەوانە لە نمونەترینی ئەو شتانەن کە داتان هێناون، جا من وەڵامی

ئەوەت نادەمەوە، من بۆم باسکراوە لە رسول اللە وە ﷺ کە فەرموویەتی : (هیچ ئوممەتێك نییە بیدعەیەك لە دینەکەیدا دابهێنێ ئیللا سوننەتێکی هاوشێوەی ئەوە لە دەست دەدا)، جا دەست گرتن بە سوننەتەوە خۆشەویستترە لام لە داهێنانی بیدعە .

**١٠٠** - ابن عباس فەرمووی : هیچ ساڵێك نییە ئیللا بیدعەیەکی تێدا زیندوو دەکرێتەوە، و سوننەتێکی تێدا دەمرێنرێ، تا ئەوەی بیدعە زیندوو دەبێ و سوننەت دەمرێ .

**١٠١** - ابي ادريس الخولاني وتی : ئەگەر ئاگرێك ببینم لە مزگەوتدا و نەتوانم بیکوژێنمەوە لام خۆشەویستترە لەوەی بیدعەیەکی تێدا ببینم و نەتوانم بیگۆڕم .

**١٠٢** - ابي الدرداء رضي الله عنه فەرمووی : کەمی لە سوننەتدا باشترە لە تێکۆشان لە بیدعەدا، تۆ ئەگەر شوێن بکەوی باشترە لەوەی بیدعە بکەی، وە ڕێگاکە هەڵە ناکەی تاکو شوێنی ئەثەر بکەوی .

**١٠٣** - الهيثم بن عمران وتی : گوێم لە إسماعيل بن عبيدالله بوو دەیوت : پێویستە لەسەرمان ئەوە لەبەر بکەین کە لە رسول اللە وە ﷺ بۆمان هاتووە، چونکە اللە دەفەرموێ : ﴿**وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا**﴾ [**الحشر** : ٧]، چونکە لای ئێمە وەکو قورئانە .

**١٠٤** - حسان بن عطية وتى : جبريل سوننەتى دادەبەزاندە سەر رسول الله ﷺ هەروەكو چۆن قورئانى دادەبەزاندە سەرى، وە سوننەتى فێر دەكرد هەروەكو چۆن قورئانى فێر دەكرد .

**١٠٥** - وە يحيى بن ابي كثير وتى : سوننەت دادوەرە لەسەر قورئان، بەڵام قورئان دادوەر نييە لەسەر سوننەت .

**١٠٦** - وە مكحول وتى : قورئان زياتر پێويستى بە سوننەتە وەك لەوەى سوننەت پێويستى بە قورئان بێ .

---

: مەبەست لەم دوو ئەثەرە ئەوەيە كە قورئان سوننەت تەفسير ناكات بەڵكو سوننەت قورئان تەفسير دەكات .

**١٠٧** - وە مكحول وتى : سوننەت دوو دانەيە : سوننەتێكيان وەرگرتنى فەزيلەت و پلە بەرزيە، و وازهێنان لێى بۆ غەيرى خۆى گوناهە، وە سوننەتێكيان وەرگرتنى فەرزە .

---

: لە ئەثەرى ١١٦ بە دواوە نوسەر رحمه الله زۆر بە جوانى باس لە سوننەت دەكات .

**١٠٨** - سليم بن اخصر وتى : زياتر له جارێك گوێم له ابن عون بوو دەيوت : سێ شت پێی ڕازيم بۆ خۆم و براكانم .

يەكەميان : ئەوەيە كە ئەم پياوە موسڵمانە سەيری قورئان بكات و فێری بێ و بيخوێنێ و لێی ڕابمێنێ و لێی بڕوانێ .

وە دووەميان : ئەوەيە كە سەيری ئەو ئەثەر و سوننەتە بكا جا لە بارەيەوە پرسيار بكا و تێكۆشانيشی لەگەڵيدا بێ .

وە سێيەميان : ئەوەيە واز لەو خەڵكە بهێنێ مەگەر بۆ چاكە نەبێ .

**١٠٩** - ابي عطاء اليحبوري وتى : عبادة بن الصامت رضي الله عنه پێمی فەرموو : ئەی ابو عطاء، چی دەكەن ئەگەر قورئان خوێن و زاناكانتان هەڵبێن تا دەگەنە لوتكەی چياكان و لەگەڵ ئاژەڵانی كێويدا بن؟

وتی : وتم : جا بۆ وا دەكەن؟

فەرمووی : لە ترسی ئەوەی نەيان كوژن .

وتی : وتم : سبحان الله! ئايا دەيانكوژين لە كاتێكدا كتێبی الله لە ناوماندايە و دەيخوێنينەوە؟

فەرمووی : دايكت شين و ڕۆڕۆت بۆ بكا ئەی ابو عطاء! مەگەر يەهود تەوراتيان بۆ نەمايەوە پاشان گومڕا بوون لێی و وازيان لێهێنا؟ مەگەر نەصارا

ئینجیلیان بۆ نەمایەوە و پاشان گومڕا بوون لێی و وازیان لێهێنا؟ ئەمانە چەند ڕێبازێکن هەندێکیان شوێنی هەندێکی تریان دەکەون، واللە هیچ شتێك لە پێش ئێوەوە نەبووە ئیللا لە ناو ئێوەشدا ڕوودەدات .

**١١٠** - الهزيل وتی : عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : ئەوانەی لە هەموو خەڵکی زیاتر سەر و سیمایان بە نەوەکانی ئیسرائیل دەچێت ئێوەن، شوێنی ئاسەواریان دەکەون قەیتانی پێڵاو بە پێڵاو، هیچ شتێك لە ناو ئەوان ڕوو نادات ئیللا هەمان شت لە ناو ئێوەش ڕوودەدات .

**١١١** - الربيعة الجرشي رضي الله عنه دەیفەرموو : ماتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێی وترا : با چاوەکانت بخەون، وە گوێیەکانت ببیستن، و دڵت تێ بگات، فەرمووی : (چاوەکانم خەوتن، و گوێیەکانم بیستیان، و دڵم تێگەیشت . جا پێم وترا : خاوەنێك ماڵێکی دروست کرد، و خوانێکی ڕێك خست، وە بانگخوازێکی نارد، جا هەر کەس وەڵامی بانگخوازەکەی دایەوە ئەوا دەچێتە ماڵەکەوە، و لە خوانەکەش دەخوات، و خاوەنەکەش لێی ڕازی دەبێ . وە هەر کەس وەڵامی بانگخوازەکەی نەدایەوە ئەوا ناچێتە ماڵەکەوە، و لە خوانەکەش ناخوات، و خاوەنەکەش لێی تووڕە دەبێ، جا الله خاوەنەکەیە، و محمد ﷺ بانگخوازەکەیە، و ماڵەکە ئیسلامە، و خوانەکەش بەهەشتە) .

**١١٢** - هشام بن عروة له باوكيەوە فەرمووی : سوننەتەكان سوننەتەكان، چونكە سوننەتەكان كۆڵەگەی دینن .

**١١٣** - ابي الحلال وتی : سەردەمێك بەسەر خەڵكيدا دێت كە پياو هەڵدەستێ پرسيار لە بارەی سوننەتەكانی محمد ﷺ دەكات، كەچی هيچ كەس نادۆزێتەوە پێی ڕابگەيەنێ .

**١١٤** - الحسن بن شقيق لە عبدالله وە رضي الله عنه فەرمووی : جبريل كە قورئانی دادەبەزاندە سەر پێغەمبەر ﷺ وەكو پەردەيەك دەيگرت، پاشان لەسەر دڵی دايدەنا، جا بۆی ئاسان دەبوو وە لەبەريشی دەكرد، پاشان دەيخوێندەوە، بەڵام بۆ سوننەتەكان جبريل فێری دەكرد و بە دەنگ لەگەڵيدا دەيوتەوە .

**١١٥** - لە محمد بن جبير بن مطعم وە لە باوكيەوە رضي الله عنه، فەرمووی : لەگەڵ رسول الله ﷺ بووين لە ناوچەی جوحفە، پاشان هاتە دەرەوە بۆ لامان و فەرمووی : (ئايا مەگەر شاهێدی نادەين كە هيچ خوايەك نييە شايەنی پەرستن بێ جگە لە الله، و منيش پێغەمبەری الله م وە قورئانيش لە لايەن الله وە هاتووە) .

وتمان : بەڵێ .

فەرمووی : (دەی مژدەتان لێبێ، چونکە قورئان لایەکی بە دەستی الله وەیە، و لایەکی بە دەستی ئێوەوەیە، جا دەستی پێوە بگرن چونکە لە دوای ئەو هەرگیز بە هیلاکدا ناچن و گومڕا نابن) .

## باسكردنی ئەوەی كە سوننەت لەسەر چەند ڕوو خۆی دەنوێنێ؟

١١٦ - **ابو عبدالله** - واتە نوسەر، هەموو ئەو ابو عبدالله یانەی دوای ئەویش دێن هەر مەبەستی لە نوسەرە - وتی : سوننەت لەسەر چەند ڕوویەك خۆی دەنوێنێ : سوننەتێكیان زاناكان كۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی كە واجبە، وە سوننەتێكیان كۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی نافیلەیە - واتە واجب نییە، بۆ نمونە سیواك كردن - ، وە سوننەتێكیان جیاواز بوون تێیدا : ئاخۆ واجبە یان نافیلەیە .

پاشان ئەو سوننەتەی كە كۆدەنگ بوون لەسەر ئەوەی واجبە لەسەر دوو ڕوو خۆی دەنوێنێ : یەكێكیان كردەوەیە، و ئەوی تریان ئیمانە .

جا ئەوەی كە كردەوەیە لەسەر چەند ڕوویەك خۆی دەنوێنێ :

سوننەتێكیان كۆدەنگ بوون لەسەر ئەوەی كە تەفسیرە بۆ ئەو شتانەی كە الله بە موجمەلی و تێكڕایی فەرزی كردووە لە كتێبەكەیدا، و تەفسیری نەكردووە، وە تەفسیر كردن و ڕوون كردنەوەكەی بۆ رسول الله ﷺ داناوە، هەروەكو الله عز و جل فەرموویەتی : ﴿**وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ**﴾ [**النحل** : ٤٤] .

وە ڕووی دووەم : سوننەتێکە کە جیاواز بوون تێیدا، هەندێکیان وتویانە : نەسخ کەرەوەی بەشێکە لە ئەحکامەکانی قورئانە، وە هەندێکیان وتویانە : نەخێر، بەڵکو ڕوون کەرەوەیە دەربارەی تایبەت و گشتی قورئان وە نەسخ کەرەوەی نییە؛ چونکە سوننەت قورئان نەسخ ناکاتەوە، بەڵکو تایبەت و گشتی ڕوون دەکاتەوە، وە تەفسیری موجمەل و نادیاریشی دەکات .

---

: وشەی موجمەل و وشەی عام هەردووکیان لە کوردیدا بە واتای (گشتی) دێن، وە موجمەل بە واتای (تێکڕا) ش دێ، والله اعلم .

وە ڕووی سێیەم : سوننەتێکە کە کۆدەنگن لەسەر ئەوەی زیادەیەکە لەسەر ئەوەی کە الله حوکمی پێ داوە لە کتێبەکەیدا، وە سوننەت زیادەیەکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، هیچ بنچینەیەکی لە قورئاندا نیە مەگەر ئەوە نەبێ کە بە گشتی فەرمان کراوە بە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر ﷺ، و تەسلیم بوون بۆ حوکم و بڕیاری ئەو، وە نەکردنی ئەوەی کە نەهی لێکردووە .

جا من هەر یەك لەو جۆرانە تەفسیر دەکەم کە ئەهلی تێگەیشتن بەڵگەیان پێ هێناوەتەوە لەوەی کە بە دوایدا دێ، ان شاء الله .

## ناسخ و منسوخ چین؟

پێناسەی النسخ : لەڕوی زمانەوانیەوە: بەمانای گۆڕین و لابردن یان ڕەشکردنەوە دێت.

وەکو عەرەب دەڵێت : «نسخت الشمس الظل» .

ڕۆژ سێبەری نەسخ کرد واتە (سڕیەوە و نەیهێشت).

- پێناسەی النسخ لە لای زانایانی علوم القرآن بریتیە لە: [رفع الحكم الشرعي بخطاب شرعي] واتە: لادان و ڕەشکردنەوە و گۆڕینی حوکمێکی شەرعی قەدیم بەبەڵگەیەکی شەرعی نوێ.

- بەڵگەی شەرعیش لە دوو سەرچاوەوە وەردەگیرێت :

١ - قورئانی پیرۆز لە لایەن الله وە سبحانە و تعالى کە مطلق ە.

٢ - فەرموودە لەلایەن پێغەمبەر ەوە ﷺ کە مقيد.

- پێناسەی المنسوخ : ئەو حوکمەیە کە لابراوە و کاری پێناکرێت.

- سێ مەرجمان هەیە لە گۆڕینی حوکمی شەرعی (نەسخ) :

١ - دەبێ لابردنی ئەو حوکمە لەلایەن (شارع) الله تعالى وە پێغەمبەرەوە ﷺ بێت.

٢ - دەبێ مەنسوخ (ئەو حوکمە قەدیمە کە کاری پێناکرێت) پێش ناسخ (ئەو حوکمە نوێیە کە کاری پێدەکرێت) هاتبێت.

٣ - دەبێت ئەو حوکمە گشتی بێت، و بۆ کاتێك و کەسێکی دیاری کراو نەبێت.

## نەسخ لە چی ڕوودەدات؟

نەسخ لە ئەمر و نەهی دێت بەڵام لە عەقیدەدا نەسخ بوونی نیە.

**١** - الله سبحانە وتعالی دەفەرموێت ﴿**شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ**﴾ [**الشُّورَى : ١٣**] .

واتە : ئاینەی بۆ داناوون كە فەرمانی داوە بە نوح و ئەوەش نیگامان كردووە بۆ تۆ (ئەی محمد ﷺ) و ئەوەش كە فەرمانمان داوە بە ابراهیم و موسی و عیس كە لەسەر ئەو ئاینەبن بەرێك و ڕاستی و جیاوازی تێدا مەكەن.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە نوح ەوە (علیهم سلام) تا پێغەمبەرمان ﷺ كە هەموویان لە عەقیدەدا یەك بوون و گۆڕین لە عەقیدەدا نیە.

**٢** - وە هەروەها الله سبحانە وتعالی دەفەرموێت: ﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ**﴾ [**سورة البقرة : ١٨٣**].

واتە : ئەی ئەوانەی كە بڕواتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە و فەرزكراوە هەر وەكو چۆن فەرزكراوە لەسەر ئەو ئومەتانەی لە پێش ئێوەدا بوون.

**٣** - وە هەروەها دەفەرمووێت: ﴿**وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِير**﴾ [**آل عمران: ١٤٦**].

واتە : زۆر لە پێغەمبەران جەنگ و كوشتاریان كردووە لەگاڵیاندا (شانبەشانیان) زۆر لە زانایان و خواناسان.

## ناسینی نەسخ وە گرینگی پێدانی :

زانینی ناسخ و منسوخ عولەمایان زۆر گرنگیان پێداوە وە ڕێگەیان نەداوە كەسێك فەتوا بدات و قەزاوەت بكات تاكو عیلمی نەبێ بە ناسخ و منسوخ.

ڕۆژێك علي بن أبو طالب قازیەكی بینی پێی فەرمووو: ئایا تۆ شارەزایت لە عیلمی ناسخ و منسوخ؟

وتی: نا، ئەویش پێی فەرموو :خۆت بە هیلاك برد و خەڵكیش بە هەلاكەت دەبەیت.

## - ڕێگاكانی ناسینی ناسخ و منسوخ :

١ - لە قسەی پێغەمبەرەوە ﷺ یان لە هاوەڵانەوە :

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (ڕێگریم لێدەكردن لە چون بۆ گۆڕستان ئێستا بچن سەردانی بكەن).

3 - كۆدەنگی هەموو ئومەتی لەسەر بێت كە ئەمە ناسخە و ئەمە منسوخە.

٣ - زانینی شوێن و كاتی دابەزینی ئایەتەكان كە ئەم ئایەتە لە كوێ دابەزیوە لە مەككە یان مەدینە.

## جۆرەكانی نەسخ لە قورئاندا :

١ - نەمانی ئایەتەكە بە خوێندنەوە و حوكم:

لە صحیح مسلم هاتوە عائشة رضي الله عنها دەڵێت: (پێشتر لە قورئاندا ئەو ئایەتە هەبوو كە دە جار مناڵ شیری ئافرەتێك بخواتەوە لێی حەرام دەبێ، دواتر نەسخ كرا بە پێنج جاری دیار و ئاشكرا).

ئەمە نە ئایەتەكە ماوە نە حوكمەكەش.

**٢** - حوکمەکەی نەماوە خوێندنەوەکەی بمێنێتەوە.

حیکمەت چیە لەوەی حوکمەکەی لاچوو بێت و خوێندنەوەکەی مابێتەوە؟

**أ** - لەبەر ئەوەی قورئان دەخوێندرێتەوە بۆ ئەوەی حوکمەکانی لێ بزانین و کاری پێ بکەین، وە لەبەر ئەوەش کە کەلامی پەروەردگارە و پاداشتی لەسەرە.

**ب** - زۆربەی کات نەسخ بۆ ئاسان کردنە لەسەر خەڵکی، وە مانەوەی خوێندنەوەکەی بۆ ئەوەیە کە خەڵکی هەمیشە ئەو نیعمەتەیان بیربێتەوە.

**٣** - خوێندنەوەکەی نەمێنێت و حوکمەکەی بمێنێت، یەکێك لەوانە ئەم ئایەتەیە:

(الشيخ والشيخة إذا زينا فارجموهما البتة نكالاً من الله، والله عزيز الحكيم) ئەم ئایەتە لەسەر بەردباران هاتبوو دواتر نەسخ کرا و خوێندنەوەکەی نەما بەڵام حوکمەکەی ماوە، واتە ئایەتەکە نەماوە بۆ خوێندنەوە بەڵام حوکمەکەی ماوە و کاری پێ دەکرێ.

## باسكردنى ئەو سوننەتەى كە تەفسیرە بۆ ئەو شتەى كە الله بە موجمەلى فەرزى كردووە، لەوەى كە ماناكەى نازانرێ بەو دەربڕینە كە دابەزیوە بە بێ ڕوون كردنەوە و فێركردنى پێغەمبەر ﷺ

**١١٧ - ابو عبدالله** وتى : بینیم بنچینەى هەموو فەرزەكان تەفسیرەكەى نازانرێ، وە ئینكاریش ناكرێ لە جێبەجێ كردنى و ئیش پێكردنى، مەگەر بە فێركردن و تەفسیرى رسول الله ﷺ نەبێت، لەوانە : نوێژ و زەكات و ڕۆژوو و حەج و جیهاد، الله عزَّوَجَل فەرموویەتى : ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا﴾ **[النساء : ١٠٣]**، جا الله بە موجمەلى فەرز بوونەكەى باس كردووە لە كتێبەكەیدا و تەفسیرى نەكردووە، وە باسى ژمارەى نوێژەكان و كاتەكانى نەكردووە، بۆیە پێغەمبەرەكەى ﷺ كردووە بە تەفسیركار بۆى، وە كردوویەتى بە ڕوون كەرەوەى تایبەت و گشتى و ژمارەى نوێژەكان و كات و سنورەكانى، وە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە كە ئەو نوێژانەى الله فەرزى كردوون پێنج نوێژن لە ڕۆژ و شەوێكدا، لەو كاتانەش كە ڕوونى كردۆتەوە و دیارى كردووە، جا نوێژى بەیانى بە دوو ڕكعەت داناوە، وە نیوەڕۆ و عەسر و عیشاى بە چوار داناوە، وە مەغریبیش سێ دانە .

وە ڕایگەیاندووە کە فەرزە لەسەر ئەوکەسانەی کە عاقڵن - واتە کە عەقڵیان تەواوە و شێت نین - و باڵغ بوونە لە کەسانی ئازاد و کۆیلەش، بە نێر و بە مێیانەوە، ئیللا ئەوانە نەبێ کە سوڕی مانگانەیان هەیە چونکە ئەوان نوێژیان لەسەر نییە .

وە جیاکاری کردووە لە نێوان نوێژی الحضر - واتە ئەوەی لە شوێنی خۆت و غەیری سەفەر دەیکەی - لەگەڵ نوێژی سەفەر، وە تەفسیری ژمارەی ڕکوع و سجود و قورئان و زیکر خوێندنیشی تێیاندا کردووە، وە ئەوەش کە تێیدا دەکرێ لە حەرام کردنی : تەکبیرکردنە، تاوەکو ئەوەی کە دەکرێ لە حەڵاڵ کردنی : سەلام دانەوەیە .

---

: واتە کە سەرەتا دەست بە نوێژ دەکەیت دەبێ تەکبیرەی ئیحرام بکەیت کە ئەوەش تەکبیرەی یەکەمە لە نوێژدا وە بۆیەش ناوی لێنراوە (التحريم) چونکە هەموو شتێك حەرام دەکرێ کە بیکەیت لە قسەکردن یان خواردن و خواردنەوە وە جگە لەوانەش لە ناو نوێژەکەتدا وە حەڵاڵ کردنی مەبەست لەوەیە کاتێك نوێژەکە تەواو دەبێت و سەلام دەدەیتەوە، بۆیەش ناوی لێنراوە (التحليل) چونکە ئیتر حەڵاڵە ئەوانە بکەیت کە ڕێگریت لێکرابوون لە خواردن و خواردنەوە و قسەکردن . . . هتد .

**١١٨** - وە بە هەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ بە سوننەتەکەی تەفسیری زەکاتیشی کردووە، ڕایگەیاندووە کە زەکات واجب دەبێ لە بەشێکی ماڵ بەبێ بەشێکی تری، لەو کات و سنورانەی کە دیاری کردووە و ڕوونی کردۆتەوە، جا زەکاتی نەقدی واجب کردووە لە زێڕ و زیو، وە لە ئاژەڵاندا لە حوشتر مەڕ و ماڵات و مانگای لەوەڕگا، وە لە بەشێك لەوەی کە لە زەویەوە دەردەچێ و بەبێ بەشێکی تری، وە لە باقی ماڵ و سامان خۆش بووە و زەکاتی لێ واجب نەبووە، وە زەکات واجب نییە لەو شتانەی کە زەکاتی لێ واجب بووە مادام نەگەیشتووەتە ئەو سنورەی کە بۆی دانراوە، هەروەکو فەرموویەتی : (کەمتر لە پێنج ئۆقیە زیو بەخشینی تێ ناکەوێ، وە کەمتر لە پێنج ویسق بەخشینی تێ ناکەوێ، وە کەمتر لە پێنج ذود بەخشینی تێ ناکەوێ)، هەروەها فەرموویەتی : (وە کەمتر لە چل سەر مەڕوماڵات بەخشینی تێ ناکەوێ)، وە فەرموویەتی : (وە کەمتر لە سی مانگا بەخشینی تێ ناکەوێ) .

---

: ئۆقیە و ویسق و ذود یەکەی پێوانەیی ئەو کاتە بوونە، یەك ئۆقیە چل درهەم بووە لە زیوی پوخت کە پێنج ئۆقیە دەکاتە ٢٠٠ درهەم، کە بە تەرازووی ئێستە ٥٩٥ گرام زیوی پوخت دەکات، هەروەها ویسقێکیش ٦٠ صاع بووە لە بەروبوم، کە پێنج ویسق ٣٠٠ صاع دەکا، و بە تەرازووی ئێستە دەکاتە نزیکی ٦٥٣ کیلۆ بەروبوم، وە ذودیش بۆ حوشتر بەکارهێنراوە کە لە نێوان ٣ بۆ ١٠ دانەیە، والله اعلم .

وە ڕوونی کردۆتەوە کە زەکات واجب دەبێ لەسەر ئەو کەسەی واجب بووە لەسەری ئەگەر حاڵەتێکی بەسەر هات لەو ڕۆژەوەی کە ئەو ماڵەی هەیەتی و زەکاتی لەسەرە، پاشان لە داهاتووشدا لەسەری واجب دەبێ لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر، مەگەر ئەوە نەبێ کە لە زەویەوە دێتە دەرەوە، چونکە زەکات لەوە وەردەگیرێ کە واجب بووە لەسەری هەر لە کاتی دروێنە کردن و هاڕینیدا، ئەگەر چی حاڵەتێکیشی بەسەردا نەهات، و پاشان بەو شێوەیە چەند ساڵێك مایەوە زەکاتی لەسەر واجب نابێ جگە لە زەکاتی یەکەم .

هەموو ئەمانە وەرگیراون لە سوننەتی رسول اللە ﷺ، وە بەم تەفسیرەوە بوونیان نیە لە کتێبی اللە دا .

**١١٩** - وە بە هەمان شێوە بۆ ڕۆژوو، اللە تبارك و تعالی فەرموویەتی : ﴿**كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ**﴾ [**البقرة** : ١٨٣]، جا پێغەمبەر ﷺ فەرزبوونی ڕۆژووی خستۆتە سەر باڵغ بووەکان لە ئازاد و کۆیلەکان، بە نێر و مێیانەوە، جگە لەوانەی سوڕی مانگانەیان هەیە، چونکە ئەوان ڕۆژوویان لەسەر هەڵگیراوە، جا ڕۆژوو و نوێژی یەکسان کردووە لەوەی کە هەڵگیراوە لەسەر ئەوانەی کە سوڕی مانگانەیان هەیە، بەڵام لە قەرەبوو کردنەوەدا جیاوازی تێیان خستووە، قەرەبوو کردنەوەی ڕۆژووی لەسەر واجب کردوون، بەڵام قەرەبوو کردنەوەی نوێژی لەسەر هەڵگرتوون - واتە ئافرەتێك سوڕی مانگانەی هەبێ نوێژ و ڕۆژووی لەسەر نیە، بەڵام کە پاك بووەوە پێویستە ڕۆژووەکەی قەرەبوو بکاتەوە و پێویست ناکا نوێژەکەی

قەرەبوو بكاتەوە - . وە ڕوونی کردۆتەوە کە ڕۆژوو بریتیە لە : دەست گرتن بە گەورەییەکەوە لە خۆگرتنەوە لەو شتانەی کە فەرمان بە خۆ لێ گرتنەوەیان کراوە، هەر لە کاتی فەجرەوە تاکو ماتنی شەو .

**١٢٠** - هەروەکو - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەس پێش فەجر ڕۆژوو نەگرێ ئەوا ڕۆژووی بۆ نییە) .

---

: مەبەستی لە نیەت هێنانەکەیەتی کە نیەتیش بە دڵ دەهێنرێ نەك بە زمان .

**١٢١** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەس نیەتی ڕۆژوو نەهێنێ لە شەودا پێش کاتی فەجر ئەوا ڕۆژووی بۆ نییە) .

ابو صالح وتی : ئەمە لیث گێڕاویەتیەوە لە عبدالله بن ابی بکر، وە گوێم لێبووە لە یحیی بن ایوب .

**١٢٢** - عدي بن حاتم رضي الله عنه فەرمووی : کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿**وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ**﴾ **[البقرة : ١٨٧]**، دوو پەتم لە یەکتر بەست، یەکێکیان سپی و ئەوی تر ڕەش، وە کردمە ژێر سەرینەکەمەوە - بالیف - ، پاشان سەیرم دەکرد، کەچی سپی و ڕەشەکە دەر نەدەکەوتن و جیا نەدەکرانەوە، جا کە بەیانیم کردەوە چووم بۆ لای رسول الله

ﷺ، وه ئەوەم پێ ڕاگەیاند کە کردبووم، فەرمووی : (سەرینەکەت پانە) وه فەرمووی : (بەڵکو ئەوە سپێتی ڕۆژ و ڕەشایی شەوە) .

**١٢٣** - وه الشعبي لە عدي بن حاتم ەوە هەمان فەرموودەی گێڕاوەتەوە، وه فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (بەڵکو ئەوە سپێتی ڕۆژە لە ڕەشایی شەودا) .

**١٢٤** - وه الله تبارك و تعالى فەرموویەتی : ﴿ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾ [**البقرة** : ١٨٧]، جا پێغەمبەر ﷺ بە سوننەتەکەی تەفسیری کردووە کە چۆن شەو دێت بۆ تەواو کردنی ڕۆژوو .

**١٢٥** - عبدالله بن أبي أوفى رضي الله عنه فەرمووی : لەگەڵ رسول الله ﷺ بووین لە سەفەرێکدا لە مانگی ڕەمەزان، جا کە خۆر ئاوابوو، فەرمووی : (ئەی فلان، دابەزە جۆی هاڕاومان بۆ تێکەڵ بە ئاو یان شیر بکە) .

فەرمووی : ئەویش دابەزی، پاشان بۆی هێنا، وه پێغەمبەر ﷺ خواردیەوە، و بە ئاماژەکرن بە دەستیەوە فەرمووی : (ئەگەر خۆر لێرەوە ئاوا بوو، وه شەو لێرەوە داهات، ئەوا ڕۆژووان بەربانگ دەکاتەوە) .

**١٢٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر شەو ڕووی تێکردن، و ڕۆژ پشتی تێکردن، وه خۆر ئاوا بوو، ئەوا ڕۆژووان بەربانگ دەکاتەوە) .

**١٢٧** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر ڕۆژ پشتی تێکردن، و شەو ڕووی تێکردن، وە خۆر ئاوا بوو، ئەوا ڕۆژووان بەربانگ دەکاتەوە) .

**١٢٨** - **ابو عبدالله** وتی : وە بە هەمان شێوە بۆ حەج، الله حەجی فەرز کردووە لە کتێبەکەیدا، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿**وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا**﴾ [**آل عمران : ٩٧**]، جا رسول الله ﷺ کە ڕوون کەرەوەی مەبەستی الله یە ڕوونی کردۆتەوە کە حەج لە تەمەندا واجب نییە تەنها یەك جار نەبێ .

**١٢٩** - ابي هريرة رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ وتاری بۆ خەڵکی دا، فەرمووی : (خەڵکینە، الله حەجی لەسەرتان فەرز کردووە) .

پیاوێك هەستا و وتی : هەموو ساڵێك؟ هەتا سێ جار ئەمەی وتەوە و رسول الله ش ﷺ ڕووی لێ وەردەگێڕا .

پاشان فەرمووی : (ئەگەر بموتایە بەڵێ ئەوا واجب دەبوو، ئەگەر واجبیش بوایە ئەوا پێی هەڵنەدەستان) .

پاشان فەرمووی : (وازم لێبهێنن لەوەی کە تێیدا وازم لێهێناون، چونکە ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون تیاچوون بە پرسیار کردن، و جیاوازیان بوو لەگەڵ پێغەمبەرانیان، جا فەرمانی هەر شتێکم پێتان کرد ئەوا بچنە لای بەو

ڕادەیەی کە پێتان دەکرێ، وە نەهیم لە هەر شتێك لێ کردن ئەوا لێی دوور کەونەوە) .

**١٣٠** - ابي هريرة فەرمووی : کاتێك الله حەجی فەرز کرد پیاوێك وتی : هەموو ساڵێك يا رسول الله ﷺ ؟

سێ جار ڕووی لێ وەرگێڕا و پاشان فەرمووی : (گەر بموتایە بەڵێ ئەوا واجب دەبوو، وە ئەگەر واجبیش بوایە لەسەرتان ئەوا توانای کردنیتان نەبوو)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ﴾ [المائدة : ١٠١] .

**١٣١** - ابن عباس رضي الله عنه فەرمووی : پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی حەج کردن لە هەموو ساڵێکدا؟

فەرمووی : (هەموو موسڵمانێك یەك حەجی لەسەرە، خۆ ئەگەر بموتایە : لە هەموو ساڵێکدا ئەوا دەبوو) .

**١٣٢** - علي رضي الله عنه فەرمووی : کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗا﴾ [آل عمران : ٩٧] .

وتیان : يا رسول الله ﷺ هەموو ساڵێك؟ بێدەنگ بوو .

وتیان : هەموو ساڵێك؟

فەرمووی : (نەخێر، خۆ ئەگەر بموتایە : بەڵێ واجب دەبوو) بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿يَأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسْئَلُواْ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ [المائدة : ١٠١] .

---

: لە سەنەدەکەی منصور بن وردان هەیە کە تەنها ابن حبان بە سیقەی داناوە، بەڵام واتاکەی صحیحە .

**١٣٣** - الله عز و جل فەرموویەتی : ﴿فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ﴾ [البقرة : ١٩٧]، جا پێغەمبەر ﷺ بە سوننەتەکەی ڕوونی کردۆتەوە کە فەرز بوونی حەج : دەنگ بەرزکردنەوەیە، وە دەنگ بەرزکردنەوە و کاتەکانی حەج و عومرەی هەموو تەفسیر کردووە، وە ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە ئەو کەسەی ئیحڕام دەبەستێ چی لەبەردەکا و چی لەبەر ناکا، وە جگە لەمانەش لە کاروباری حەج کە ڕوون کردنەوەکەی بوونی نییە لە کتێبی الله دا .

**١٣٤** - جعفر بن محمد لە باوکیەوە : هاتین بۆ لای جابر بن عبدالله رضي الله عنه، پێم وت : سەبارەت بە حەجی رسول الله ﷺ هەواڵم بدەرێ، فەرمووی : رسول الله ﷺ دەرچوو و ئێمەش لەگەڵی دەرچووین، تا گەیشتە ناوچەی ذا الحليفة، دواتر رسول الله ﷺ لە مزگەوتەکەدا نوێژی کرد، پاشان سواری

القصواء - ناوی حوشترەکەی پێغەمبەرە ﷺ - بوو تا ئەوەی کە حوشترەکەی خستیە سەر گردەکە، فەرمووی : جا من تا چاوم بڕی کرد سەیری بەردەمیم کرد سواری و پیادەی لێبوو، وە لە لای ڕاستیشی هەمان شت، وە لە پشتیشیەوە هەمان شت هەبوو، وە رسول الله ﷺ لە ناو ئێمەدا بوو و قورئانی بەسەردا دادەبەزی، وە ئەو لێکدانەوەی قورئانی دەزانی، و هەر کارێکی پێ بکردایە ئێمەش پێمان دەکرد، جا دەنگی تەوحیدی بەرز کردەوە : (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ، وَالنِّعْمَةَ، لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ) .

- نوسەر وتی : - وە ئەهلی عیلم لە ماوەڵان و ئەوانەی دوای خۆیان ڕێککەوتون لەسەر ئەوەی فەرزی حەج دەنگ بەرزکردنەوەیە .

**١٣٥** - سالم لە باوکیەوە وتی : پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا : ئەوەی کە ئیحرام دەبەستێ چی لەبەردەکا؟

فەرمووی : (ئەوەی ئیحرام دەبەستێ قەمیس و عەمامە و بُرْنُسٍ و شەرواڵ لەبەر ناکا لەگەڵ جلێکیش کە وەرس و زەعفەرانی بەرکەوتبێ، لەگەڵ جووتە خوف، مەگەر نەعلی دەست نەکەوێ، ئەو کات با بیانبڕێ تاکو دەکەونە خوار قولە پێوە) .

---

: بُرْنُسٍ جليّكه كه هه‌موو جه‌سته و سه‌ريش داده‌پۆشێ، وه وه‌رس ڕوه‌كێكى زه‌رده و بۆنى خۆشه .

**١٣٦** - سالم له باوكيه‌وه كه پياوێك وتى : يا رسول الله ﷺ : ئه‌وه‌ى ئيحرام ده‌به‌ستێ چى له خۆى دوور ده‌خاته‌وه - واته نابێ به‌كارى بهێنێت - ؟

فه‌رمووى : (ئه‌وه‌ى ئيحرام ده‌به‌ستێ قه‌ميس و شه‌رواڵ، و عه‌مامه و بُرْنُسٍ وه جليّكيش كه وه‌رس و زه‌عفه‌رانى به‌ركه‌وتبێ له‌به‌ر ناكا، له‌گه‌ڵ جووته خوف، هه‌ر كه‌سيش نه‌على ده‌ست نه‌كه‌وت، با خوف بكاته پێى، وه با بيانبڕێ تاكو ده‌كه‌ونه خوار قوله پێيه‌وه) .

**١٣٧** - ابن عباس رضي الله عنه فه‌رمووى : رسول الله ﷺ بۆ ئه‌هلى مه‌دينه : ناوچه‌ى ذا الحليفة ى دياريكرد، وه بۆ ئه‌هلى شام : ناوچه‌ى جوحفه، وه بۆ ئه‌هلى نه‌جد : قرن المنازل، وه بۆ ئه‌هلى يه‌مه‌ن : يلملم .

فه‌رمووى : (ئه‌مانه بۆ ئه‌وان، وه بۆ ئه‌وانه‌ش كه له دواى ئه‌مان دێن له غه‌يرى ئه‌هله‌كه‌ى خۆيان، له‌و كه‌سانه‌ى كه ده‌يانه‌وێ حه‌ج و عومره بكه‌ن، جا هه‌ر كه‌س له‌وان نه‌بوو، ئه‌وا له‌گه‌ڵ ئه‌هله‌كه‌ى بێ، وه ئاوا بۆ ئاوا، هه‌تاوه‌كو ئه‌هلى مه‌ككه‌ش له‌وێوه ده‌ست ده‌كه‌ن به ده‌نگ به‌رزكردنه‌وه) .

: والله اعلم، مەبەستی ئەوەیە شوێنی ئیحرام بەستنی بۆ جیا کردونەتەوە .

**١٣٨** - وە عبدالله بن طاووس ئەم فەرموودەیەی بۆ باسکردین لە باوکیەوە لە ابن عباس ەوە، وە الله تبارك و تعالى فەرموویەتی : ﴿**وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ**﴾ [**الحج : ٢٩**]، جا رسول الله ﷺ بە سوننەتەکەی ژمارەی طەواف و چۆنیەتیەکەی ڕوون کردۆتەوە .

**١٣٩** - جابر بن عبدالله رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ کاتێك گەیشتە کەعبە، حەوت جار طەوافی کرد، و سێ جار هەروەلەی کرد، وە چوار جار ڕۆشتنی ئاسایی ئەنجامدا .

---

: هەروەلە لە ڕۆشتنی ئاسایی خێراترە و لە ڕاکردنیش هێواشترە] .

**١٤٠** - لە ابن شهابەوە کە سالم بن عبدالله پێی ڕاگەیاندووە لە باوکیەوە فەرمووی : رسول الله م ﷺ بینی کە دەچوو بۆ مەککە، کاتێك دەستی لە بەردە ڕەشەکە دەدا، یەکەم شت طەوافی دەکرد کە دەگەیشت، سێ طەوافی لە حەوت طەوافەکە بە خێرایی ئەنجامدەدا .

**١٤١** - عبدالله بن عمر رضي الله عنهما فەرمووی : رسول الله ﷺ طەوافی کرد کە گەیشتە مەککە، یەکەم شت دەستی دا لە بەردەکە، پاشان سێ دانە لە حەوت طەوافەکەی بە خێرایی ئەنجامدا، و چوار طەوافیش بە ڕۆشتنی ئاسایی، پاشان تا طەوافی کرد دوو ڕکعەت نوێژی کرد لای مقام ەوە - مقامی ابراهیم - پاشان سەلامی دایەوە .

---

: ئەوەی دەردەکەوێ لەم ئەثەرانەوە ئەوەیە کە طەواف حەوت دانەیە و سێ دانەی بە هەروەلە دەکرێ و چواریشی بە ڕۆشتنی ئاسایی .

**١٤٢** - عبدالرزاق وتی گوێم لە ابن جریج بوو کە بۆ الثوري دەگێڕایەوە، وتی : گوێم لە عطاء بوو دەیوت : پێغەمبەر ﷺ سێ طەوافی بە خێرایی بە هەروەلە کرد، کە لە نێوانیاندا ڕۆشتنی ئاسایی تێدا نەبوو، وە چوار دانەشی بە ڕۆشتن کرد، پاشان ابو بکر و عمر و عثمان و خەلیفەکان بە هەروەلە کردیان .

---

: ئەم ئەثەرە مرسل ە چونکە عطاء تابعیە و نەگەیشتووە بە پێغەمبەر ﷺ، بەڵام واتەکەی صحیحە هەروەکو لە ئەثەرەکانەی پێشوو دەردەکەوێت .

**١٤٣** - عطاء وتى : پێغەمبەر ﷺ سێ طەوافی یەكەمی بە هەروەلە ئەنجامدا، و چواریشی بە ڕۆشتن، وە ابو بكر و عمر و خەلیفەكانیش هەمان شتیان كرد .

**١٤٤** - وە الله لە كتێبەكەیدا جیهادی فەرز كردووە، هەروەكو فەرموویەتی : ﴿ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [**التوبة** : ٤١] .

وە فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ﴾ [**التوبة** : ١١١] .

وە فەرموویەتی : ﴿مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِي ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ (٣٨) إِلَّا تَنْفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ [**التوبة** : ٣٨ و ٣٩] .

لەگەڵ زۆرێك لە ئایەتی تر كە جیهاد واجب دەكەن و فەرمانی پێ دەكەن، جا ئەوەی پێویست بوو لەسەر ڕووكەشی ئەم ئایەتانە و گشتییەكەی : كە جیهاد فەرزێكی پێویست بێ لەسەر هەموو موسڵمانێك بە دیاریكراوی ئەگەر توانای هەبوو، مەگەر قورئان یان سوننەت یان كۆدەنگی دەلالەت لەوە بكەن كە لەسەر كەسی دیاریكراوە نەك گشتی، جا ئێمە بینیمان قورئان و سوننەت دەلالەت لەوە دەكەن كە جیهاد فەرز نییە لەسەر هەموو موسڵمانێك بە دیاریكراوی، هەروەكو فەرموویەتی : ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ

**مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ** ﴾ [**التوبة** : ١٢٢]، جا دەلالەتی لەوە کردووە کە فەرز بوونی جیهاد لەسەر ئەوانەیە کە دەرچن بۆی کە بە ڕادەی پێویست توانایان هەیە، جا ئەگەر ئەوانەی بە ڕادەی پێویست توانایان هەیە دەرچوون بۆ جیهاد ئەوا تاوانەکە لەسەر هەر هەموویان لا دەچێ, وە ئەگەر ئەوانەی کە بە ڕادەی پێویست توانایان هەیە دەرنەچوون ئەوا بە یەکەوە تاوانبار دەبن، لەبەر فەرمایشتی : ﴿**إِلَّا تَنْفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا**﴾ [**التوبة** : ٣٩]، هەندێك لە ئەهلی عیلم - سەبارەت بەم ئایەتە - وتویانە : واتە : ئەگەر هەمووتان واز لە دەرچوون بێنن ئەوا سزاتان دەدەم .

**١٤٥** - گوێم لە الربيع بن سليمان بوو لە الشافعي ـوە دەیگێڕایەوە، وتی : الله تبارك و تعالى فەرموویەتی : ﴿**كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ**﴾ [**البقرة** : ٢١٦]، لەگەڵ ئەوەی کە جەنگی واجب کردووە لە جگە لە یەك ئایەتدا، وتی : فەرزبوونی جیهاد ئەگەری هەبوو کە وەکو فەرزبوونی نوێژ و جگە لە نوێژ بە گشتی فەرز بێت، وە ئەگەری هەبوو کە بە گشتی فەرز نەبێ، جا قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەلالەتیان لەوە کردووە کە فەرزبوونی جیهاد لەسەر ئەوانەیە کە پێی هەستن کە بە پێی پێویست توانایان هەیە پێی هەستن، هەتاوەکو دوو شت کۆببنەوە :

یەکەمیان : ئەوەندە بن کە دوژمن و ترس لەسەر موسڵمانان کەم بکەنەوە لەوانەی ڕێگری دەکەن .

دووەمیان : ئەوەیە کە لە موسڵمانان ئەو کەسانە جیهاد بکەن کە لە جیهادەکەیاندا کیفایەت هەیە، هەتاوەکو ئەوەی کە ئەهلی بتەکان موسڵمان بن، یان ئەهلی کتاب جزیە بدەن .

جا ئەگەر لە موسڵمانان ئەو کەسانە پێی هەستان کە بە ڕادەی پێویست توانایان بۆی هەیە، ئەوا ئەو کەسانەی کە ماونەتەوە و دەرنەچوونە تاوانەکەیان لەسەر لادەچێ، وە فەزڵ بۆ ئەو کەسانەیە کە بەشداری جیهادیان کردووە بەسەر ئەو کەسانەوە کە ماونەتەوە و دەرنەچوونە، هەروەکو الله تبارك و تعالى فەرموویەتی : ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ تاکو فەرمایشتی : ﴿وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ **[النساء : ٩٥]** .

الشافعي وتی : جا ئەوەی ڕوون کردەوە کە الله بەڵێنی باشەی بەو کەسانە داوە کە نوقستانییان نییە و دانیشتوون : بەوەی کە تاوانبار نابن بە مانەوە، وە بە باشە بەڵێنیان پێدراوە بە مانەوەیان، بەڵکو بەڵێنی باشەی پێداون لەوەی کە فراوان بووە بۆیان ئەگەر بێتو ئیماندار بن و بە هۆی شك و گومان و نیەتی خراپەوە نەمابێتنەوە، ئەگەر چی فەزڵی غەزاشیان واز لێهێنابێ .

الشافعي وتى : وه رسول الله ﷺ غه‌زایه‌كی نه‌كردووه و من زانیبیێتم ئیللا كه‌سانێك ماونه‌ته‌وه و ده‌رنه‌چوونه، غه‌زای به‌دری ئه‌نجامدا و پیاوانێكی ناسراویش مانه‌وه، وه به هه‌مان شێوه سالْی فه‌تحی مه‌ككه و جگه له‌و له غه‌زاكانی تریش - كه‌سانێك مانه‌وه - .

**١٤٦** - وه پێغه‌مبه‌ر ﷺ له كاتی غه‌زای ته‌بوك و ئاماده‌كردنی بۆ كۆبوونه‌وه بۆ ڕۆمه‌كان فه‌رمووی : (با له هه‌موو دوو پیاوێك یه‌ك پیاو ده‌رچێت، وه باقی موجاهیدان با له مالْ و ئه‌هله‌كه‌یاندا بمێننه‌وه) .

الشافعي وتى : جا فه‌رزبونی جیهاد به‌و جۆره‌یه كه باسم كرد، ئه‌وه‌ی ماوه‌ته‌وه له تاوانبار بوون ده‌رده‌چێ به هۆی ئه‌و كه‌سه‌ی كه پێی هه‌لْده‌ستێ و به ڕاده‌ی پێویست توانای هه‌یه، وه هه‌موویان به یه‌كه‌وه تاوانبار ده‌بن ئه‌گه‌ر به یه‌كه‌وه بمێننه‌وه .

**١٤٧** - **ابو عبدالله** وتى : جا ئه‌م فه‌رزانه هه‌موویان كۆكن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی فه‌رزن، وه جیاوازن ده‌رباره‌ی فه‌رزبوونیان به دیاریكراوی یان گشتی، وه جیاوازن ده‌رباره‌ی ژماره و كات و سنوره‌كانیان، رسول الله ﷺ ئه‌مانه‌ی به سوننه‌ته‌كه‌ی ڕوون كردۆته‌وه، ڕایگه‌یاندووه كه نوێژ له ڕۆژ و شه‌وێكدا پێنج جار واجبه له پێنج كاتدا، وه زه‌كات له هه‌موو سالْێكدا یه‌ك جار واجبه به‌و

جۆرەی کە تەفسیرمان کرد، وە حەج واجب نیە لە تەمەندا تەنها یەك جار نەبێ، وە الله تبارك و تعالى فەرموویەتی : ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ﴾ [البقرة : ٢١٦] .

وە فەرموویەتی : ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ﴾ [البقرة : ١٨٣] .

وە فەرموویەتی : ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا﴾ [النساء : ١٠٣] .

وە فەرموویەتی : ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ﴾ [آل عمران : ٩٧] .

جا هەروەکو چۆن سوننەت دەلالەتی کردووە لەوەی کە ئەم فەرزانە واجبن لەسەر هەندێك خەڵکی واجب نین لەسەر هەندێکی تر، بەو جۆرەی کە گێڕامانەوە و تەفسیرمان کرد، بەو شێوەیەش دەلالەتی کردووە لەوەی کە جیهاد واجبە لەسەر هەندێك و لەسەر هەندێکی تر واجب نیە، جا ڕوونی کردۆتەوە کە جیهاد واجب نییە ئیللا لەسەر ئازادەکان نەبێ لە پیاوە باڵغەکان، وە واجب نیە لەسەر ئافرەتان و منداڵان .

**١٤٨** - لە عائشة بن طلحة وە لە عائشة ی دایکی ئیمانداارانەوە رضي الله عنها فەرمووی : وتم : یا رسول الله ﷺ ، ئێمە - واتە ئێمەی ئافرەت - جیهاد بە باشترینی کردەوەکان دەبینین، دەی ئایا جیهادت لەگەڵ نەکەین؟

فەرمووی : (نەخێر، بەڵام باشترین جیهاد حەجێکە کە هیچ تاوانێکی تێکەڵ نەبێت) وە عائشة پوری ئەو بوو - واتەعائشة ی دایکی ئیمانداران پوری عائشة بن طلحة بوو - .

**١٤٩** - أنس بن مالك رضي الله عنه فەرمووی : ئافرەتان هاتن بۆ لای رسول الله ﷺ وتیان : یا رسول الله ﷺ، پیاوان فەزڵیان بە دەستهێنا بە جیهاد کردن لە پێناو الله، دەی ئایا ئێمەش کردەوەیەکمان نییە بگەینەوە بە موجاهیدان لە پێناو الله؟

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئیشی هەر یەکێك لە ئێوە لە ماڵەکەی خۆیدا دەگاتەوە بە کردەوەی موجاهیدان لە پێناو الله) .

وە ئەهلی عیلم جیاوازییان نەبوو دەربارەی ئەوەی کە رسول الله ﷺ جیهادی فەرز نەکردووە لەسەر ئافرەتان و کۆیلەکان، وە لەسەر ئەو ئازادانەش کە باڵغ نەبوونە .

**١٥٠** - لە ابي اسحاق وە : کە گوێی لە البراء بن عازب رضي الله عنه بووە دەیفەرموو : من و ابن عمر بە بچوك زانراین، فەرمووی : کۆچکاران زیاتر بوون لە شەست کەس، وە پشتیوانانیش زیاتر بوون لە دوو سەد و چل کەس .

---

: مەبەستی شەڕی بەدرە، تەمەنیان کەم بووە و نەیان هێشتووە بەشداری شەڕ بکەن .

**١٥١** - عمر بن زيد بن جارية وتى : باوكم زيد بن جارية بۆى باسكردم كه رسول الله ﷺ هەندێك كەسى بە بچووك زانى لە ڕۆژى ئوحددا، لەوانە : زيد بن جارية - واته خۆى - و البراء بن العازب، و زيد بن ارقم و سعد بن حبيبة و ابو سعيد الخدري و عبدالله بن عمر .

**١٥٢** - لە عامر بن سعد وە لە باوكيەوە رضي الله عنه فەرمووى : رسول الله ﷺ دەرچوونى عمير بن ابي وقاص ى بۆ بەدر ڕەتكردەوە، و بە بچوكى زانى، جا عمير گريا و ئەويش مۆڵەتى پێدا .

سعد فەرمووى : منيش شمشێرەكەيم بۆ بەست، وە بەشدارى بەدرم كرد و ڕووخسارم هيچى پێوە نەبوو جگە لە تاڵە موويەك كە دەستم پێدا دەهێنا . پاشان الله ڕيشى بۆ زياد كردم واتە البنين .

**١٥٣** - لە نافع ەوە لە ابن عمر ەوە رضي الله عنه فەرمووى : نيشانى پێغەمبەر ﷺ درام لە ڕۆژى ئوحوددا، لەو كاتەدا چواردە ساڵ بووم، بۆيە مۆڵەتى شەڕكردنى پێ نەدام، پاشان ڕۆژى خەندەق نيشانى درام و ئەو كات پانزە ساڵ بووم بۆيە مۆڵەتى شەڕكردنى پێدام .

نافع وتى : ئەمەم بۆ عمر بن عبدالعزيز باس كرد وتى : ئەم ئەثەرە دەيكەينە نێوان جەنگاوەران و منداڵانەوە .

جا هەر كەسێك تەمەنی كەمتر بوایە لە پانزە ساڵ بە منداڵ دایدەنا، وە هەر كەس پانزە ساڵ بوایە وەكو جەنگاوەر دایدەنا .

**١٥٤** - ابن عمر فەرمووی : نیشانی پێغەمبەر ﷺ درام لە ڕۆژی ئوحوددا، لەو كاتەدا چواردە ساڵ بووم، بۆیە مۆڵەتی نەدام، پاشان ڕۆژی خەندەق نیشانی درام و ئەو كات پانزە ساڵ بووم بۆیە مۆڵەتی دام .

**١٥٥** - نافع لە ابن عمر ـەوە فەرمووی : نیشانی پێغەمبەر ﷺ درام لە ڕۆژی ئوحوددا، لەو كاتەدا چواردە ساڵ بووم، بۆیە مۆڵەتی پێ نەدام بۆ شەڕكردن، پاشان ڕۆژی خەندەق نیشانی درام و ئەو كات پانزە ساڵ بووم بۆیە مۆڵەتی دام .

- نافع - وتی : چووم بۆ لای عمر - بن عبدالعزیز - ، كە عمر ئەو كات خەلیفە بوو، جا ئەم فەرموودەیەم بۆ باسكرد، وتی : ئەمە سنورێكە لە نێوان بچوك و گەورەدا، بۆیە نامەی بۆ كاربەدەستەكانی نوسی كە - جەنگاوەریتی - بۆ هەر كەس دانێن كە پانزە ساڵ بێت، وە بۆ هەر كەس كە كەمتر بێ بیگێڕنەوە بۆ لای خێزانەكەی .

**١٥٦** - لە نافع ـەوە لە ابن عمر ـەوە كە رسول الله ﷺ لە ڕۆژی خەندەقدا ابن عمر و رافع بن خدیج ی قبوڵ كردووە، كە ئەوان لەو كاتەدا پانزە ساڵ بوون

.

**١٥٧** - خالد بن ذكوان وتى : پرسيارم له الربيع رضي الله عنها كرد، وتم : لاى ئێمه هەندێك ئافرەتى حروري - حروري تاقمێكن له خەواريج - هەن دەڵێن : ئافرەتان لەگەڵ رسول الله ﷺ غەزايان دەكرد، فەرمووى : غەزامان دەكرد بەڵام شەڕمان نەدەكرد، بەڵكو ئاومان دەدا بە خەڵكەكە، بريندار و كوژراوەكانيشمان دەگەڕاندەوە بۆ مەدينە .

**١٥٨** - أنس رضي الله عنه فەرمووى : رسول الله ﷺ أم سليم ى دەبرد بۆ غەزا، لەگەڵ هەندێك ئافرەتى پشتيوانان، كە ئاويان دەدا، و تەداوى بريندارەكانيان دەكرد .

**١٥٩** - عطاء وتى : نجدة الحروري نامەى بۆ ابن عباس نوسى، پرسيارى لێدەكرد دەربارەى كوشتنى منداڵان، وە دەربارەى كۆيله : ئاخۆ هيچ پشكێكى هەيه له غەنيمەت؟ وە دەربارەى ئافرەتان : ئايا دەهێنران يان ئامادەى جەنگ دەبوون؟ دەربارەى يەك لەسەر پێنج ئايا بۆ كێيه؟

ابن عباس رضي الله عنه نامەى بۆ نوسيەوە : ئەمما بۆ منداڵان، ئەگەر تۆ الخضر يت و كافر و ئيماندار دەناسيتەوە، ئەوا بيانكوژە . ئەمما بۆ كۆيله، هيچ پشكێكى له غەنيمەت نيه بەڵام بەشێكى كەمێكى پێ دەدرێ، ئەمما بۆ ئافرەتان، پێغەمبەر ﷺ دەيبردن و تەداوى بريندارەكانيان دەكرد، وە نەخۆشەكانيان بەسەر دەكردەوە، بەڵام بەشدارى جەنگيان نەدەكرد . ئەمما

بۆ یەك لەسەر پێنج، دەڵێین : ئەوە بۆ ئێمەیە، جا قەومەكەمان لاڤی ئەوەیان لێدا كە بۆ ئێمە نییە .

**١٦٠** - یزید بن هرمز وتی : نجدة نامەی نارد بۆ ابن عباس و پرسیاری لێدەكرد دەربارەی شتانێك، ابن عباس فەرمووی : خەڵكی دەڵێن : ابن عباس نامە بۆ حروریەكان دەنوسێ، خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ كە من دەترسم عیلم بشارمەوە ئەوا نامەم بۆ نەدەنارد، جا نجدة نامەی بۆ نارد : أما بعد، پێم بڵێ : ئایا رسول الله ﷺ غەزای بە ئافرەتان دەكرد؟ ئایا پشكی بۆیان دادەنا؟ وە ئایا منداڵانی دەكوشت؟ وە دەربارەی یەك لەسەر پێنج، بۆ كێیە؟

ابن عباس یش نامەی بۆ نوسیەوە : نامەت نوسیوە و پرسیارم لێ دەكەی : ئایا رسول الله ﷺ غەزای بە ئافرەتان دەكرد؟ غەزای پێیان دەكرد، تەداوی برینداراەكانیان دەكرد، وە لە غەنیمەت پێیان دەدرا بەڵام بۆ پشك، پشكی بۆیان دانەدەنا، وە نوسیوتە : ئایا رسول الله ﷺ منداڵانی دەكوشت؟ رسول الله ﷺ منداڵانی نەدەكوشت، بۆیە منداڵان مەكوژە مەگەر ئەوە نەبێ كە وەكو الخضر بزانیت دەربارەی منداڵەكە كە كوشتی، كافر لە ئیماندار جیا بكەیتەوە، جا كافر بكوژی و واز لە ئیماندار بهێنی .

وە پرسیارت لێکردووم : دەربارەی یەك لەسەر پێنج، بۆ کێیە؟ دەڵێین : بۆ ئێمەیە، بەڵام قەومەکەمان سەرپێچیان کردین دەربارەی، ئێمەش ئاراممان گرت لەسەری .

: نجدة الحروري یەکێك بووە لە سەرانی خەواریج، نامەی بۆ ابن عباس ناردووە و ئەویش وەڵامی داوەتەوە، جا مەبەست لە الخضر ئەو پیاوەیە کە لەگەڵ پێغەمبەر موسى بوو علیه السلام الله تعالى هەواڵی پێدابوو منداڵەکە کافر دەردەچێ بۆیە کوشتی، بەسەرهاتەکەی لە سورەتی الکهف باس کراوە، وە یەك لەسەر پێنجیش بەشێکە لە غەنیمەت و لە سورەتی الأنفال ڕوون کراوەتەوە، والله اعلم .

**١٦١ - ابو عبدالله** وتی : وە الله عز و جل فەرموویەتی : ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ [**الأنفال** : ٤١]، جا الله تبارك و تعالى یەك لەسەر پێنجی غەنیمەتی بۆ ئەو کەسانە داناوە کە ناوی هێنان، وە لە چوار لەسەر پێنجی بێدەنگ بووە و فەرمانی بە دابەشکردنی نەکردووە لە کتێبەکەیدا، وە ڕوونی نەکردۆتەوە کە بۆ کێیە، بۆیە رسول الله ﷺ ئەوەی بە سوننەتەکەی ڕوون کردۆتەوە، جا دابەشی کردووە بەسەر ئەوانەی کە ئامادەی شوێنەکەن - واتە گۆڕەپانی جەنگ - ، یەکسانە لە نێوان پیاوانی بەهێز و لاوازدا، وە فەزڵی سوارچاکی داوە بەسەر پیادەدا، جگە

لەمەش کە ئەحکامی جیهاد و سیرە و سوننەتەکانی ڕوون دەکاتەوە، کە لە شوێنی خۆیدا ڕوون کردنەوەی ئەمانەش دێن إن شاء الله تعالى .

**١٦٢** - لە عبدالله بن شقیق ەوە لە پیاوێك لە بەلقینەوە لە ئامۆزایەکی خۆیەوە وتی : چووم بۆ لای رسول الله ﷺ کە لەو کاتەدا لە دۆڵی القرىٰ بوو، وتم : یا رسول الله ﷺ فەرمانت بە چی پێکراوە؟

فەرمووی : (فەرمانم پێکراوە شەڕ لەگەڵ خەڵکیدا بکەم تاکو دەڵێن : لا الە الا الله، وە نوێژ دادەبەستن و زەکات دەدەن) .

وتم : ئەوانەی لە لاتن کێن؟

فەرمووی : (یەهود کە غەزەبیان لێگیراوە، لەگەڵ نەصارا کە گومڕا بوونە)

وتم : ئەی چی دەڵێی دەربارەی ئەم سامانە؟

فەرمووی : (یەك لەسەر پێنجی بۆ الله، و چوار لەسەر پێنجی بۆ ئەوانە) واتە بۆ موسڵمانان .

وتم : ئایا کەس شایستەترە بەوە لە کەسێکی تر؟

فەرمووی : (نەخێر، خۆ ئەگەر بەشێك لە گیرفانی خۆت ببەخشیت نابیتە شایستەتر لە برا موسڵمانەکەت) .

---

: له سەنەدی نوسەر كەسی نەناسروای تیایە، بەڵام ئەم لەفزە بە سەنەدی صحیحیش بوونی هەیە .

**١٦٣** - ابو عبدالله وتی : وە الله عز و جل فەرموویەتی : ﴿**وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ**﴾ [**الأنفال : ٤١**]، جا الله بە گشتی باسی خزمانی كردووە، وە هەندێكیانی دیاری نەكردووە بە بێ هەندێكی تریان، بۆیە رسول الله ﷺ خزمانی دابەش كرد بەسەر بەنو هاشم و بەنو المطلب دا بە بێ باقی خزمەكانی تری، جا بە سوننەتەكەی ڕوونی كردۆتەوە كە الله مەبەستی لە خزمایەتی بریتی بووە لە هەندێك خزمایەتی و مەبەستی هەندێكی تریان نەبووە .

**١٦٤** - جبیر بن مطعم رضي الله عنه فەرمووی : كاتێك رسول الله ﷺ پشكی خزمانی دابەش كرد، لە نێوان بەنو هاشم و بەنو المطلب، من و عثمان بن عفان چووین بۆ لای، وتمان : یا رسول الله ﷺ، ئینكاری لە فەزڵی ئەوانەی بەنو هاشم ناكەین كە الله تۆی ناویاندا داناوە، بەڵام بەشی بەنو المطلب ت دا و بەشی ئێمەت نەدا، لە كاتێكدا ئێمە و ئەوان لە تۆوە یەك پلەمان هەیە؟!

فەرمووی : (ئەوان بە جێیان نەهێشتووم نە لە ئیسلام و نە لە جاهیلیەتیشدا، وە بەنو هاشم و بەنو المطلب یەك شتن) وە پێغەمبەر ﷺ پەنجەكانی بە یەكەوە نوساند - لە كاتی وتنی ئەم فەرمایشتەدا - .

**١٦٥** - جبیر بن مطعم لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەمان شتی گێڕاوەتەوە، وە ئەم زیادەیەی فەرمووە : رسول الله ﷺ یەك لەسەر پێنجی پێنج بەشەكەی بە گەنم و خورما و جۆ دابەش كرد .

**١٦٦** - لە جبیر بن مطعم ـەوە : كە رسول الله ﷺ لە یەك لەسەر پێنجەكە هیچ بەشی بۆ بەنو عبدالشمس و بەنو نوفل دانەنا هەروەكو چۆن داینا بۆ بەنو هاشم و بەنو المطلب، وە ابو بكر هەر وەكو رسول الله ﷺ دابەشی دەكرد، وە عمر بەشی دەدان دواتر بێ بەشیان دەكردن .

**١٦٧** - لە ابن شهاب ـەوە : سعید بن المسیب پێی ڕاگەیاندم كە جبیر بن مطعم پێی ڕاگەیاندووە كە خۆی و عثمان بن عفان چوونە بۆ لای رسول الله ﷺ قسەی لەگەڵ بكەن دەربارەی یەك لەسەر پێنجی خەیبەر كە دابەشی كرد لە نێوان بەنو هاشم و بەنو المطلب دا، وتیان : یا رسول الله ﷺ، بەشت دا بە براكانمان لە بەنو المطلب بن عبدمناف، و هیچت نەدا بە ئێمە، خزمایەتیشمان

وەكو خزمایەتی ئەوان وایە، رسول الله ﷺ پێیانی فەرموو: (من هاشم و المطلب وەكو یەك شت دەبینم).

وە جبیر بن مطعم فەرمووی: وە رسول الله ﷺ هیچ بەشی لە یەك لەسەر پێنج نەدا بە بەنو عبدالشمس و بەنو نوفل، بەو شێوەیەی كە بەشی دا بە بەنو هاشم و بەنو المطلب.

١٦٨ - وە ابن شهاب وتی: وە ابو بكر هەروەكو رسول الله ﷺ دابەشی دەكرد.

١٦٩ - **ابو عبدالله** وتی: الشافعي وتی: وە هەموو قورەیش خزمی پێغەمبەرن ﷺ، بەنو عبدالشمس هاوتای بەنو المطلب ن لە خزمایەتیدا، و بە یەكەوە نەوەی دایك و باوكێكن، ئەگەر چی هەندێك لە بەنو المطلب جیابوویێتنەوە بە لە دایك بوونی هەندێك لە بەنو هاشم بەبێ ئەوان، جا كاتێك پشكەكە بۆ ئەوانە نەبوو كە جیابوونەتەوە بە لە دایكبوون لە بەنو المطلب بە بێ ئەوانەی كە بە لە دایكبوونی بەنو هاشم یان نەدەزانین، دەلالەتی لەوە كرد كە بە تایبەت پێیاندرا بە بێ غەیری خۆیان بە خزمایەتی لە ڕەگی بنەچەكەیان، لەگەڵ ئەوەی كە كۆبووبوونەوە لە سەرخستنی پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگاكە و پێشی و پاش، وە ئەوە الله جل ثناؤه بۆیانی ویستووە بە تایبەت، وە بەنو هاشم لە ناو قورەیش لە دایك بوون، جا كەس بە لە دایكبوونی هیچ شتێكی پێنەدراوە لە

یەك لەسەر پێنجەكە، وە بەنو نوفل ماوتای بەنو المطلب ە لە ڕەگی بنەچەكەیانەوە .

**١٧٠** - وە الشافعي وتی : الله فەرموویەتی : ﴿**وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ**﴾ [**الأنفال** : ٤١]، جا كە رسول الله ﷺ السلب ی دا بەو جەنگاوەرەی كە بەرەو پێشەوە دەڕوا، سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەلالەتی لەوە كرد كە غەنیمەت كراوە بە پێنج بەش جگە لە السلب، ئەگەر السلب دەست بكەوێت، خۆ ئەگەر دەلالەت كردن بە سوننەت نەبوایە و حوكمدان بە ڕووكەش بوایە، ئەوا دەستی هەموو ئەوانەمان دەبڕی كە ناوی دزیان دەچێتە سەر، و وە پشكی خزمایەتیمان دەدا بە - هەموو - ئەوانەی كە لە نێوان ئەو و رسول الله ﷺ خزمایەتی هەیە، پاشان هەمووی تەواو دەبوو بۆ خێڵەكانی عەرەب، چونكە لە نێوانیاندا پەیوەندی ڕەحم بوونی هەیە، وە السلب یشمان دەكردە پێنج بەش، چونكە ئەویش لە غەنیمەت دەبوو جگە لەو بەشەی تری غەنیمەتە .

---

: والله اعلم، السلب ئەو بەشەیە كە هەر كەس دوژمنێكی كوشت ئەوا بەشەكەی وەردەگرێ، جا دەڵێت ئەگەر سوننەت نەبوایە و حوكممان بە ڕووكەش بدایە لە غەنیمەت حسابمان دەكرد، خۆ ئەگەر واشمان بكردایە هەموو غەنیمەتەكان دەبوون بە هی عەرەب چونكە عەرەب هەموویان خزمایەتیان هەیە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، هەروەها هەموو دزێكیش

دەستی نابڕدرێ، ئەوە سوننەتە کە ڕوونی دەکاتەوە کێ دەست بڕینی لەسەرە و کێ لەسەری نیە
.

**١٧١ - ابو عبدالله** وتی : الله تبارك و تعالى فەرموویەتی : ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ **[البقرة : ٢٧٥]** .

وە فەرموویەتی : ﴿لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾ **[النساء : ٢٩]** .

جا الله بە موجمەلی باسی حەلاڵیەتی فرۆشتن و حەرامیەتی ڕیبای کردووە لە کتێبەکەیدا، بەڵام تەفسیری ڕیبای نەکردووە لە کتێبەکەیدا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە سوننەتەکەی تەفسیری کردووە .

**١٧٢** - لە مالك بن أوس بن الحدثان ەوە کە گوێی لە عمر بن الخطاب رضي الله عنه بووە دەیفەرموو : رسول الله ﷺ فەرمووی : (زێڕ بە زیو ڕیبایە ئیللا بە هاء و هاء نەبێ، وە خورما بە خورما ڕیبایە ئیللا بە هاء و هاء نەبێ، وە جۆ بە جۆ ڕیبایە ئیللا بە هاء و هاء نەبێ) .

---

: هاء و هاء دەستەواژەیەکە و مانەکەشی ئەوەیە یەکێکیان بڵێ ها بیگرە ئەوی تریش بڵێت بێنە .

**١٧٣** - ابي قلابة وتى : له شام بووم له ئەڵقەيەكدا كە مسلم بن يسار ى تێدا بوو، پاشان ابو الأشعث هات، وتيان : ئەى ابو الأشعث، جا دانيشت و وتى : غەزايەكمان كرد و بەسەر خەڵكيەوە معاوية رضي الله عنه بەرپرس بوو، جا غەنيمەتێكى زۆرمان دەسكەوت، وە لەوەى دەستمان كەوتبوو سينيەكى زيوى تێدابوو، معاوية فەرمانى بە پياوێك كرد كە بيفرۆشێتەوە بە موچەى سەربازەكان، خەڵكيش پێشبڕكێيان بۆى دەكرد، ئەمەش گەيشتەوە بە عبادة بن الصامت رضي الله عنه هەستا و فەرمووى : بيستم رسول الله ﷺ نەهى دەكرد لە فرۆشتنى زێڕ بە زێڕ، و زيو بە زيو، و گەنم بە گەنم، و جۆ بە جۆ، و خورما بە خورما، و خوێ بە خوێ، مەگەر هەردووكيان وەكو يەك بن، و ئامادە بن لەوێ، جا هەر كەس زيادى كرد يان داواى زياترى كرد، ئەوا ڕيباى كردووە .

بۆيە خەڵكەكە ئەوەى بردبوويان گەڕاندريانەوە، ئەمەش گەيشتەوە بە معاوية و ئەويش هەستا و وتارى دا، فەرمووى : ئەو پياوانە چييانە كە لە رسول الله وە ﷺ فەرموودە دەگێڕنەوە! خۆ ئێمە هاوەڵێتيمان كرد و بينيمان كەچى ئەوەمان لێ نەبيست؟!

عبادة ش هەستا و بەسەرهاتەكەى گێڕايەوە، پاشان فەرمووى : ئەوە باس دەكەين كە بيستومانە لە رسول الله وە ﷺ ئەگەر چى معاوية پێى ناخۆشيش بێ، يان فەرمووى : ئەگەر چى لوتى معاوية بچێ بە خۆڵدا، گرنگ نيە لام كە لە

شەوی ڕەشدا هاوەڵێتی نەکەم . ئەمەی فەرموو یان هاوشێوەی ئەمەی فەرموو
.

---

: مەبەست لەو کارەی ئیمامی معاوية رضي الله عنه ئەوە بووە کە ئەو سینیە بفرۆشێتەوە بە موچەی سەربازەکان کە هێشتا وەریشیان نەگرتبوو وە خەڵکیش لەو کاتەدا پێشبڕکێیان بووە کە بیکڕن ئەمە دەریدەخات هەندێکیان ویستویانە زیاتر پێ دە، دیارە درهەمی ئەو کات لە زیو بووە، جا دەبێ زیو بە زیو بفرۆشرێتەوە و هەمان کێش بن نەك زیاتر بێ و هەردوو زیوەکەش ئامادە بن نەك بڵێ دواتر بۆت دەهێنم، وە دەستەواژەی لوتی بچێ بە خۆڵدا لای عەرەب بەکار هێنراوە، ماناکەشی ئەوەیە ئەگەر پێشت ناخۆش بێ هەر دەیکەم، والله اعلم .

١٧٤ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (زێڕ بە زێڕ، و زیو بە زیو، و گەنم بە گەنم، و جۆ بە جۆ، و خورما بە خورما، و خوێ بە خوێ؛ دەست بە دەست وە نمونە بە نمونە، جا هەر کەس زیادی کرد یان داوای زیاتری کرد ئەوا ڕیبای کردووە، وەرگر و بەخشەر تێیدا وەکو یەکن) .

١٧٥ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (زێڕ بە زێڕ، و زیو بە زیو، و گەنم بە گەنم، و جۆ بە جۆ، و خورما بە خورما، و خوێ بە خوێ؛ دەبێ وەکو یەك بن، جا هەر کەس زیادی کرد یان داوای زیاتری کرد ئەوا ڕیبای کردووە، وەرگر و بەخشەر تێیدا وەکو یەکن) .

**١٧٦** - له سعيد بن المسيب ەوە له بلال ەوە رضي الله عنه فەرمووی : هەندێك خورمای خراپم لابوو، له بازاڕ فرۆشتمەوە به خورمای باشتر لەو به نیوەی پێوانه، دواتر بردم بۆ لای رسول الله ﷺ فەرمووی : (خورمام نەدیوە لەوەی ئەمڕۆ باشتر بێ! ئەمەت له کوێ بوو ئەی بلال؟!) .

فەرمووی : منیش ئەوەم بۆ باس کرد که کردبووم .

فەرمووی : (بڕۆ بیگەڕێنەوە بۆ خاوەنەکەی، وە خورماکەت وەربگرەوە و بیفرۆشه به گەنم یان جۆ، ئینجا لەم خورمایەی پێ بکڕە) .

فەرمووی : منیش ئەوەم کرد، پاشان بردم بۆی و رسول الله ﷺ فەرمووی : (خورما به خورما نمونه به نمونه، وە خوێ به خوێ نمونه به نمونه، وە زێڕ به زێڕ کێش به کێش، وە زیو به زیو کێش به کێش، جا هەر کامێکیان باشتر بوو ئەوا ڕیبایه) .

---

: پیاوانی سەنەدەکە سیقەن، هەرچەندە پچڕان هەیه له نێوان سعيد بن المسيب و بلال، بەڵام مرسل ەکانی سعيد بن المسيب صحيحن و هاوشێوەی ئەم فەرموودەیه هاتووە له صحيح البخاري (٢٣١٢) وە له صحيح مسلم (١٥٩٤) .

وە ڕیبای جاهیلیەت لەوەدا بوو کە :

**١٧٧** - يحيى بن يحيى بۆی باسکردووین لە مالك بن انس لە زيد بن اسلم کە وتویەتی : ڕیبا لە جاهیلیەتدا : ئەوە بوو کە پیاوێك حەقی لای پیاوێکی تر هەیە، جا کە وادەکەی تەواو دەبێ دەڵێ : دەدەیت یان ڕیبا دەکەی؟ ئینجا ئەگەر بیدایە ئەوا لێی وەردەگرتەوە، ئەگەر نەیدایە لە حەقەکەی زیادی دەکرد، و لەسەر پیاوەکە تەئخیری دەکرد - واتە هەتا تەئخیر بوایە حەقەکە زیاتر دەبوو، والله اعلم - .

**١٧٨** - **ابو عبدالله** وتی : پاشان پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دا دەربارەی چەند شتێك کە باسی کردن و ناویشی لێ نان ڕیبا، پاشان خەڵکی جیاوازیان تێکەوت سەبارەت بەوەی کە لە دەرەوەی ئەو شتانەیە کە پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنان، بۆیە کۆمەڵێك وتیان : هەموو شتێك کە دەپێورێ یان دەکێشرێ ئەوا وەکو ئەو شەش شتە وایە کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردن .

**١٧٩** - لە ابي مشعر ـەوە لە النخعي ـەوە کە هەردووکیان وتیان : هەموو شتێك کە بپێورێ و بکێشرێ وەکو شەش شتەکە وایە ئەگەر لە یەك جۆر بن، خۆ ئەگەر جیاواز بن ئەوا دانەیەك بە دوو دانەیە، دەست بە دەست، ئەو کات هیچ کێشەی تێدا نییە، وە ڕقیان لەوە بوو کە دوابکەوێ - واتە پێیان خۆش بووە شتەکە دەست بەجێ بدرێ و وەربگیرێ، والله اعلم - .

**١٨٠** - ابراهيم النخعي وتى : هەر شتێك كە یەك جۆر بێت و بپێورێ ئەوا نمونە بە نمونە، بەڵام ئەگەر جیاواز بوون زیاد دەبێ و زیاتر دەدرێ دەست بە دەست، وە ئەگەر شتێك یەك جۆر بێت و بكێشرێ ئەوا نمونە بە نمونە، بەڵام ئەگەر جیاواز بوون زیاد دەبێ و زیاتر دەدرێ دەست بە دەست .

**١٨١** - لە ابراهیم ەوە : ڕقی لێبووە كە هەر شتێك بپێورێ یان بكێشرێ بە دواخستن بفرۆشرێ نمونە بە نمونە، بەڵام ئەگەر جیاواز بوون كێشەی نییە دەست بە دەست .

**١٨٢** - الزهري وتى : هەر شتێك بكێشرێ ئەوا بە هەمان شێوەی زێڕ و زیو دەڕوا، وە هەر شتێك بپێورێ ئەوا بە هەمان شێوەی گەنم و جۆ دەڕوا .

**١٨٣** - عمار بن یاسر رضي الله عنه لە مزگەوتی گەورەدا فەرمووی : حوشترێكی باشتر لە دوو حوشتر، و مەڕێكی باشتر لە دوو مەڕ، و جلێكی باشتر لە دوو جل، و كەنیزەكێكی باشتر لە دوو كەنیزەك كێشەی تێدا نییە ئەگەر دەست بە دەست بوو، بەڵكو ڕیبا لە دواخستنیدایە مەگەر شتەكە بپێورێ یان بكێشرێ .

---

: واتە ئەو شتانەی كە ناوی هێنان بیانگۆڕیتەوە بە باشتر كێشەی تێدا نییە ئەگەر دەست بەجێ وەریگری و بیدەی، بەڵام شتانێك كە بپێورێن و بكێشرێن وەكو خورما و گەنم و جۆ نابێ بگۆڕدرێنەوە بە خراپتر یان باشتر، والله اعلم .

**١٨٤** - روح بن عبادة بۆی باسكردين : حيان بن عبيدالله العدوي كه سيقه بوو، بۆی باسكردين و وتی : پرسيارم له أبو المجلز كرد دەربارەی ئاڵوگۆڕ، وتی : ماوەيەك ابن عباس هيچ كێشەيەكی تێدا نەدەبينی تا ئەو كاتەی دەست به دەست بوايه، جا ابو سعيد الخدري پێی گەيشت و پێی فەرموو : هەتا كەی له الله ناترسی؟! هەتا كەی ڕيبا دەرخواردی خەڵكی دەدەی؟! ئاخۆ پێت نەگەيشتووه كه رسول الله ﷺ لای أم سلمة ی خێزانی بوو، فەرمووی : (حەزم له خورمای عەجوەيە) ئەويش كەسێكی نارد بە دوو صاعەوە و دواتر بە يەك صاع عەجوه گەڕايەوە، فەرمووی : (ئەمەتان له كوێ بوو؟) ئەوانيش پێيان وت، فەرمووی : (بيگەڕێننەوە، خورما بە خورما، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، زێڕ بە زێڕ، زيو بە زيو؛ دەست بە دەست چاو بە چاو - واته هەردوو شتەكە ئامادە بن و تەئخير نەكرێن - ، وە نمونە بە نمونە - واته هەردووكيان يەك جۆر بن، بۆ نمونە عەجوە بە عەجوە - هەر كەس زيادی كرد ئەوا ڕيبايە) پاشان ابو سعيد فەرمووی : وە ئەوەی دەكێشرێ و دەپێورێ بە هەمان شێوەيە .

ابن عباس يش فەرمووی : جزاك الله خيرا ئەی ابو سعيد، شتێكت بيرخستمەوە كه بيرم چووبۆوە، من داوای لێخۆش بوون لە الله دەكەم و تەوبە دەكەم، جا دواتر نەهی لێ دەكرد .

روح وتی : حيان پياوێكی ڕاستگۆ بوو .

: كاتێك پێغەمبەر ﷺ ناوی ئەم شەش شتەی هێناوە و بۆ نمونە فەرموویەتی زێڕ بە زێڕ یان خورما بە خورما، مەبەستی ئەوە نیە ناتوانرێ زێڕ بە خورما بگۆڕدرێتەوە، بەڵكو مەبەستی ئەوەیە ئەگەر زێڕت بە زێڕ گۆڕیەوە یان خورمات بە خورما گۆڕیەوە ئەوا دەبێ لە كێشانە و پێوانەدا وەكو یەك بن و دەست بە دەستیش بیگۆڕیتەوە نەك بەشێكت بداتێ و بەشێكی تری تەئخیر بكا، والله اعلم .

**١٨٥** - **ابو عبدالله** وتی : وە كۆمەڵێكی تر وتیان : هەر شتێك بپێورێ یان بكێشری لەو شتانەی دەخورێ یان دەخورێتەوە، ئەوا وەكو ئەو چوار شتە وایە كە پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنان ڕیبا، بەڵام زێڕ و زیو تایبەت و دیاریكراون بۆ شتی تر، هیچ شتێك لەوان ناچێ، وە هەر شتێك لەم شتانە دەرچوو ئەوا ڕیبای تێدا نییە .

**١٨٦** - لە ابي الزنادەوە لە سعيد بن المسيب ەوە كە بیستویەتی دەیوت : ڕیبا بوونی نییە ئیللا لە زێڕ و زیو نەبێ، یان لەو شتانەی دەپێورێن و دەكێشرێن كە دەخورێن و دەخورێنەوە .

**١٨٧** - لە يحيى بن سعيد ەوە لە سعيد بن المسيب ەوە كە بیستویەتی دەیوت : ڕیبا بوونی نییە ئیللا لە زێڕ و زیو نەبێ، یان لەو شتانەی دەپێورێن و دەكێشرێن كە دەخورێن و دەخورێنەوە .

١٨٨ - **ابو عبدالله** وتى : ئەمە مەزهەبى ئەهلى مەدینەیە، وە الشافعي ش كە لە عێراق بوو دەیوتەوە، پاشان لە مصر هەموو ئەو شتانەشى بۆ زیاد كرد بخورێن ئەگەر چى نەپێورێن و نەشكێشرێن . وە كۆمەڵێك وتیان : هەموو شتێك كە خواردنە و دەخورێ، ئەگەر چى نەپێورێن و نەشكێشرێن، ئەوا حوكمەكەى بە هەمان شێوەیە، ئەمە كۆتا مەزهەبى الشافعي بوو .

١٨٩ - لە ابن عمر ەوە رضي الله عنه : ڕِقى لێبووە شتێك لە خواردن بفرۆشرێ بە شتێك كە دواخستنى تێدا بێت - واتە پێى خۆش بووە یەكسەر حەقى خواردنەكە بدرێت والله اعلم - .

١٩٠ - ابن عمر فەرمووى : هەر شتێك لە خواردن كە ڕەنگیان جیاواز بوو كێشەى تێدا نییە دەست بە دەست بێ، گەنم بە خورما، جۆ بە مێوژ .

وە ڕِقى لە دواخستن بوو .

١٩١ - لە سفیان ەوە لە ابن جریج ەوە لە عطاء ەوە : ڕِقى لە - گۆڕینەوەى - خواردن بووە بە خواردنێك كە دواخستنى تێدایە .

سفیان وتى : دەڵێت : گۆشت بە گەنم یان ترۆزى یان شوتى بە گەنم .

سفیان وتى : كێشەى تێدا نابینین - واتە لە جیاوازیەكەیدا نەك لە دواخستنیدا، والله اعلم - .

**١٩٢** - له طاووس ـەوە : كە ڕِقی لێبووە هەموو خواردن - بگۆڕدرێتەوە - بە بەشێك كە دواخستنی تێدا بێ .

**١٩٣** - سفیان بۆی باسكردین لە حنظلة ـوە لە طاووس ـەوە : كە ڕقی لێبووە ڕۆن - بگۆڕدرێتەوە - بە خورمایەك كە دوا بكەوێ .

سفیان وتی : ئێمەش ڕقمان لێیە .

**١٩٤** - لە طاووس ـەوە لە باوكیەوە كە ڕقی لەوە بووە گۆشت - بگۆڕدرێتەوە - بە گەنمێك كە دوابكەوێ .

**١٩٥** - عبدالرزاق وتی : پرسیارمان لە الثوري كرد دەربارەی ئەمە، وتی : ئەمە لە باشترین فرۆشتنە لای ئێمە - والله اعلم، مەبەستی دوا خستنەكە نییە - .

**١٩٦** - وە كۆمەڵێك لە ئەمانە بۆ ئەوە چوون كە هەموو ئەوەی لەم شتانە دەردەچێ لەوانەی كە كڕین و فرۆشتنی فاسید و نەهی لێكراون، ئەوا ڕیبای تێدا نییە، ئەگەر چی حەرامیش بێ، وە چوونە بۆ ئەوەی كە ڕیبا بریتیە لەوەی : زۆر دەبێ، و زیاد دەكات و گەشە دەكات، مەگەر شتێكی تریش كە بەم شێوەیە بێ - واتە لای ئەمان هەندێ شت هەیە كە ڕاستە كڕین و فرۆشتن پێوەی حەرامە بەڵام ڕیبا نییە - .

**١٩٧** - كۆمەڵێكی تر وتیان : نەخێر، بەڵكو هەر كڕین و فرۆشتنێكی حەرام كە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێكردووە، ناوی ڕیبای دەچێتە سەر، وتیان : بەو شێوەیە وتویانە كە : ڕیبا حەفتا و شتێك دەرگایە .

وه بەڵگەیان هێناوەتەوە بە فەرموودەی عبداللە بن مسعود کە باسمان کردووە :

**١٩٨** - عبدالرحمن بن عبدالله دەیگێڕایەوە لە عبداللە وە رضي الله عنه کە فەرموویەتی : دوو رێککەوتن لە یەك رێککەوتندا دروست نییە، رسول الله ﷺ لەعنەتی لە هەموو ڕیبا خۆرێك و وەكیل و شاهێد و نوسەرەکەشی کردووە .

**١٩٩** - لە سماك ەوە : گوێم لە عبدالرحمن بن عبدالله بوو لە باوکیەوە فەرموویەتی : دوو رێککەوتن لە یەك رێککەوتندا دروست نییە، چونکە رسول الله ﷺ لەعنەتی لە هەموو ڕیبا خۆرێك و وەکیلەکەشی کردووە .

**٢٠٠** - لە عبدالرحمن بن عبدالله بن مسعود ەوە لە باوکیەوە فەرموویەتی : دوو رێککەوتن لە یەك رێککەوتندا دروست نییە یان فەرمووی حەڵاڵ نییە، چونکە رسول الله ﷺ لەعنەتی لە هەموو ڕیبا خۆرێك و وەکیل و نووسەر و شاهێدەکەشی کردووە .

**٢٠١** - عبدالله فەرمووی : دوو رێککەوتن لە یەك رێککەوتندا ڕیبایە : ئەوەیە کە پیاو بڵێ : ئەگەر بە نەقد بوو ئەوا بەم شێوەیە و بەو شێوەیە، وە ئەگەر بۆ وادەیەك بوو ئەوا بەم شێوەیە و بەو شێوەیە .

**٢٠٢** - له عبدالرحمن بن عبدالله بن مسعود ەوە لە باوكيەوە دەربارەی پیاو كە شتێك دەكڕێ لەسەر ئەوەی دینارێك بە دە دانە بدا، فەرمووی : دوو ڕێككەوتن لە یەك ڕێككەوتندا ڕیبایە .

**ابو عبدالله** وتی : جا لە وتەی عبدالله دا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی هەموو كڕین و فرۆشتنێكی فاسید ڕیبایە، وە بە هەمان شێوە وتەی عمر دەربارەی میوە كە لە سەرەتای پێگەشتنیدایە و هێشتا پێ نەگەیشتووە .

**٢٠٣** - عمر رضي الله عنه فەرمووی : ئێوە لافی ئەوە لێدەدەن كە دەرگاكانی ڕیبا دەزانن، وە من ئەگەر بیزانم لام خۆشەویستترە لەوەی هاوشێوەی مصر و حوشتر و مانگاكانیم هەبێ، بەڵام هەندێ دەرگا هەیە كە خەریكە لە هەموو كەس شاراوە دەبێ : ئەوەیە كە میوە بفرۆشرێ كە لە سەرەتای پێگەشتنیدایە و هێشتا پێ نەگەیشتووە، یان زیو بە زێڕ بفرۆشرێ یان زێڕ بە زیو بفرۆشرێ بە دواخستنەوە .

---

: والله اعلم، ئەگەر دەست بە دەست زێڕ بە زیو یان زیو بە زێڕ بفرۆشرێ كێشەی نیە، بەڵام بە دواخستنەوە كێشەی هەیە هەروەكو ئیمام عمر فەموویەتی .

**٢٠٤** - مجاهد وتی : به عبدالرحمن بن ابي ليلى م وت : فەرمووده‌یه‌کم بۆ باس بکه که ده‌رگاکانی ڕیبام بۆ کۆبکاته‌وه، وتی : بترسه له فرۆشتنی شتێك که هێشتا زه‌مان نییه - واته به ده‌ستت نه‌گه‌یشتووه, والله اعلم - .

**٢٠٥** - شريح وتی : هه‌ر که‌س دوو فرۆشتنی ئه‌نجامدا به یه‌ك فرۆشتن ئه‌وا یان که‌مترینی ده‌سکه‌وتووه، یان ڕیبا .

---

: والله اعلم، ئه‌گه‌ر نمونه‌یه‌ك بهێنینه‌وه، که‌سێك کاڵایه‌ك ده‌فرۆشێ به که‌سێکی تر و ده‌ڵێت مانگێکی تر به ١٠٠ هه‌زار پێتی ده‌فرۆشم، به‌ڵام یه‌کسه‌ر لێی ده‌کڕێته‌وه به ٨٠ هه‌زار، وه دوای مانگێك ١٠٠ هه‌زاری لێ ده‌ستێنێ، جا یان ئه‌وه‌تا قازانجه‌که‌ی ده‌ست که‌وتووه‌که که ڕیباکه‌یه یان که‌مه‌که‌ی ده‌سکه‌وتووه .

**٢٠٦** - جعفر وتی : عكرمة ی مه‌ولای ابن عباسم بینی، پێی وتم : بزانه که ده‌رگاکانی ڕیبا زیاترن له ده‌رگاکانی ته‌ڵاق، جا ئاگاداری ئه‌و شتانه ببه که دواخستنی تێ ده‌که‌وێ له‌م کڕین و فرۆشتنانه‌دا، چونکه ڕیبا له دواخستندایه .

**٢٠٧** - ابن عمر رضي الله عنهما فه‌رمووی : گوێم له عمر بوو له‌سه‌ر مینبه‌ری رسول الله ﷺ ده‌یفه‌رموو : خه‌ڵكینه، سێ شت هه‌یه خۆزگه‌م

دەخواست كە رسول اللە ﷺ جێی نەهێشتینایە هەتا بەڵێنی لەسەر وەردەگرتین ئێمەش بەوە كۆتاییمان پێی دەهێنا : - میراتی - ئەو كەسەی دەمرێ و باوك یان منداڵی نییە، وە - میراتی - باپیر، وە چەند دەرگایەك لە دەرگاكانی ڕیبا .

---

: ڕاستە رسول اللە ﷺ وەفاتی نەكرد هەتاوەكو دینەكەی بە تەواوەتی گەیاند، بەڵام مەبەستی ئیمام عمر ئەوەیە كە خۆزگەی خواستووە ئەو سێ مەسەلەیە لە ناو ئەهلی عیلمدا هیچ جیاوازیەكی تێدا نەبوایە، واللە اعلم .

**٢٠٨** - لە سعید بن المسیب ەوە لە عمر بن الخطاب ەوە رضي الله عنه فەرمووی : كۆتا شت كە دابەزیە سەر پێغەمبەر ﷺ ئایەتی ڕیبا بوو، جا وەفاتی كرد و بۆمانی تەفسیر نەكرد، بۆیە واز لە ڕیبا و گومان بهێنن .

---

: دیارە مەبەستی ئەو ئایەتانەیە كە باسی ئەحكام دەكەن، لەو كاتەش شتی گرنگتر هەبووە رسول اللە ﷺ تەفسیری بكات، هەرچەندە مەبەستی ئیمام عمر ئەوەیە كە خۆزگەی خواستووە وا تەفسیری بكات كە جیاوازی هەڵنەگرێت، مەبەستیش لە وازهێنان لە ڕیبا و لە گومان ئەوەیە كە گومانتان لە بوونی ڕیبا نەبێ، وە ئەگەر مامەڵەیەكتان بۆ هاتە پێش و لە ڕیبا دەچوو ئەوا وەكو وەرعێك وازی لێ بهێنن، واللە اعلم .

**٢٠٩** - له ابي الضحى ەوە له مسروق ەوە له عبدالله ەوە رضي الله عنه فەرمووى : ڕیبا حەفتا و شتێك دەرگایە، وە شیركیش لەوانە .

**٢١٠** - له ابراهيم ەوە له مسروق ەوە له عبدالله ەوە فەرمووى : ڕیبا حەفتا و شتێك دەرگایە، وە شیركیش لەوانە .

**٢١١** - له ابراهيم ەوە له مسروق ەوە له عبدالله ەوە فەرمووى : ڕیبا حەفتا و سێ دەرگایە، وە شیركیش لەوانە .

**٢١٢** - سلمة بن سهيل وتى : گوێم له ابي الضحى بوو له مسروق ەوە له عبدالله ەوە هەمان شتى گێڕایەوە .

**٢١٣** - له الحسن ەوە له ابي هريرة ەوە له رسول الله وە ﷺ فەرمووى : (سەردەمێك بەسەر خەڵكیدا دێ كه هیچ كەس نامێنێ ئیللا ڕیبا دەخوات، خۆ ئەگەر نەیخوات ئەوا تۆزەكەى بەردەكەوێ) .

---

: واته هەر كاریگەرى ئەوەى بەردەكەوێ به شێوەیەك ڕیباكە بخوات، بۆ نمونه میوانى كەسێك بێ كه پارەكەى به ڕیبا پەیدا كردووە، وە سەنەدەكەى پچڕانى تێدایه له نێوان الحسن و ابي هريرة لاى زانایان، بەڵام واتاكەى صحيحه والله اعلم .

**٢١٤** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سەردەمێك بەسەر خەڵكیدا دێ كە پیاو گوێ بەوە نادات كە بە چی ماڵ پەیدا دەكا: ئاخۆ بە حەڵاڵ یان بە حەرام).

**٢١٥** - ابي هريرة رضي الله عنه فەرمووی: ڕیبا حەفتا بەشە لە تاوان، كەمترینیان وەكو ئەوەیە كە پیاو بكەوێتەوە زیناوە لەگەڵ دایكی خۆیدا، وە خراپترین ڕیبا: زیادەڕەوی كردنی پیاوە لە ناموسی براكەیدا.

**٢١٦** - عبدالله رضي الله عنه فەرمووی: ئەهلی پێغەمبەرایەتی بە هیلاكدا نەچوونە تاكو ڕیبا و زینا تێیاندا بڵاو نەبۆتەوە.

**٢١٧** - سعيد بن المسيب وتی: لە ئاژەڵدا ڕیبا نییە، مەگەر لە فرۆشتنی ئەوەدا نەبێ كە لە سكی مێینەی حوشتردایە لەگەڵ ئەوەی لەسەر پشتی حوشترە، وە فرۆشتنی بێچوی بەچكە حوشتر.

**٢١٨** - **ابو عبدالله** وتی: جا لەم مەزهەبەدا فەرمایشتی الله تبارك و تعالى: ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ﴾ [البقرة: ٢٧٥]، دەبێتە گشتی بۆ هەموو ئەوەی كە ناوی لێنەنرێ ڕیبا، وە هەموو كڕین و فرۆشتنێك كە پێغەمبەر ﷺ حەرامی كردووە داخڵی فەرمایشتی: ﴿وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ [البقرة: ٢٧٥] دەبێ.

لە مەزهەبی یەكەمدا: ڕیبا دەبێتە هەموو ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنا، و ڕایگەیاند كە ڕیبایە، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەش كە لەوانەن كە

پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنان ڕبا، وە فەرمایشتی : ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ﴾ بە دیاریکراوی دەچێتە سەر هەندێ کڕین و فرۆشتن و ناچێتە سەر هەندێکی تر، کە هەموو کڕین و فرۆشتنێکە کە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێنەکردووە، هەروەکو فەرمایشتی : ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا﴾ [المائدة : ٣٨] کە دەکەوێتە سەر هەندێك دز و ناکەوێتە سەر هەندێکی تر - واتە هەروەکو چۆن هەموو دزێك حەدی دەستبڕینی لەسەر نیە ئەوا لای مەزهەبی یەکەم هەموو کڕین و فرۆشتنێکی حەرام ڕاستە حەرامە بەڵام ڕبا نیە - جا هاوشێوەی ئەمانە لە کتێبی الله دا زۆرن، زۆرمان لێ باس کرد لە غەیری ئەم شوێنەدا .

بەڵام هەر کەس لاڤی ئەوە لێبدا کە ڕبا بوونی نییە ئیللا لەو شەش شتەدا نەبێ کە پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنان، ئەوا وتەکەی پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو هەواڵانەی کە لە سەلەفەوە بۆمان هاتوون، و جیاوازە لەوەی کە ئەهلی فەتوا لە وڵاتان کۆدەنگن لەسەری، وە هیچ کەس نازانین لە سەلەف بۆ ئەم قسەیە چووبێ، وە ئەو ڕیوایەتەیان کە لە طاووس ەوەیە کە وای وتبێ صحیح نییە، بەڵکو ئەوەی صحیحە لە طاووس ەوە جیاوازە لەو قسەیە، وە ئەهلی جاهیلیەت چەند کڕین و فرۆشتنێکیان دەکرد کە هەڵخەڵەتاندن و مەترسی تێدابوو، وەکو فرۆشتنی ئەوەی ناوسکی حوشتری مێینە لەگەڵ ئەوەی سەرپشتی، هەروەها فرۆشتنی بێچووی بەچکە حوشتر، جا پێغەمبەر ﷺ نەهی لەوە کرد، وە نەهی لە فرۆشتنی مەترسیدار کرد بە موجمەلی .

**٢١٩** - له ابن شهاب ەوە : كه رسول الله ﷺ نەهی كردووە لە فرۆشتنی الملاقيح، و المضامين، و حبل الحبلة، ابن شهاب وتی : الملاقيح : ئەوەیە كە لەسكی حوشتری مێینەدایە، وە المضامين : ئەوەیە كە لەسەر پشتی حوشترە، وە حبل الحبلة : بێچووی بەچكە حوشترە .

---

: واتە حوشترێك بفرۆشی و بەچكەی بێ جا ئەو بەچكەیە پێ بگات و بەچكەی بێ دوبارە بیفرۆشیتەوە! .

**٢٢٠** - له ابي هريرة وە رضي الله عنه : كه رسول الله ﷺ نەهی كردووە لە المضامين و الملاقيح و حبل الحبلة .

**٢٢١** - الزهري وتی : پرسيار لە ابن المسيب كرا دەربارەی - ئاڵوگۆڕی - ئاژەڵ بە ئاژەڵی دواخستن - واتە دەست بەجێ نەتداتێ - وتی : لە ئاژەڵدا ڕیبا نییە، وە نەهی كرد لە المضامين و الملاقيح و حبل الحبلة .

المضامين : ئەوەیە كە لە پشتی حوشتردایە .

وە الملاقيح : ئەوەیە كە لە ناوسكیدایە .

وە حبل الحبلة : بەچكەی بەچكە حوشترە .

**٢٢٢** - سعيد بن المسيب وتى : له ئاژەڵدا ڕیبا نییه، جگه له المضامين و الملاقيح و حبل الحبلة .

**٢٢٣** - له نافعەوە ابن عمر ـەوە رضي الله عنهما : كه پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووه له فرۆشتنى حبل الحبلة .

**٢٢٤** - له ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما : كه پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووه له فرۆشتنى حبل الحبلة .

**٢٢٥** - له سعيد بن جبير ـەوە : كه پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووه له فرۆشتنى حبل الحبلة .

**٢٢٦** - له سعيد بن جبيرەوە له ابن عمر ـەوە : كه پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووه له فرۆشتنى حبل الحبلة .

**٢٢٧** - له نافعەوە له ابن عمر ـەوە : كه رسول الله ﷺ نەهى كردووه له فرۆشتنى حبل الحبلة .

**٢٢٨** - له نافعەوە له عبدالله ـەوە له رسول الله وه ﷺ : كه نەهى كردووه له فرۆشتنى حبل الحبلة .

**٢٢٩** - له نافعەوە له ابن عمر ەوە : كه پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووه له فرۆشتنی حبل الحبلة، كه فرۆشتنێك بووه ئەهلی جاهیلیەت كردویانه، ئەوەبوو پیاو حوشتری دەفرۆشت تاكو حوشترێكی مێینەی دەبوو، پاشان ئەوەشی دەفرۆشت كه له سكی مێینەكەدایه .

**٢٣٠** - ابن عمر فەرمووی : رسول الله ﷺ نەهی كردووه له كڕین و فرۆشتنی شتی هەڵخەڵەتێنەر . ئەوەبوو كه ئەهلی جاهیلیەت ئەو كڕن و فرۆشتنەیان دەكرد، پیاو حوشترێكی پیری دەفرۆشت، لەگەڵ بێچووی بێچووە حوشتر .

**٢٣١** - ابي هريرة رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ نەهی كرد له كڕین و فرۆشتنی شتی هەڵخەڵەتێنەر و كڕین و فرۆشتنی زیخ .

---

: شتی هەڵخەڵەتێنەر واته شتێك كه له ڕووكەشدا باش دیاره بەڵام له ناوەڕۆكدا خراپه، وه فرۆشتنی زیخ جۆره كڕین و فرۆشتنێكی سەردەمی جاهیلی بووه، مەبەست لەوه نیه زیخ بفرۆشن، بەڵكو پشتیان بەستووه به زیخێك تا كڕین و فرۆشتنەكەیان ئەنجام بدەن، چەند شێوازێكی هەبووه، یەكێك لەوانه ئەوەیه بۆ نمونه فرۆشیار به كڕیار بڵێ : ئەم زیخه فڕێ دەدەم كەوته سەر كام پارچه جل ئەوا پێت دەفرۆشم، یان ئەم زەویەت تا ئەو شوێنه پێ دەفرۆشم كه زیخەكەی لێ فڕێ دەدەم . وه دووەمیان ئەوه بووه كه فڕێ دانی بەردەكه بكەنه فرۆشتن، بۆ نمونه بڵێ ئەگەر ئەو بەردەم هەڵدایه سەر ئەو پارچه جله ئەوا بەوەنده پێت دەفرۆشم، وه سێیەمیان ئەوەیه بۆی بكاته هەڵبژاردن، به موشتەری دەڵێ زیخەكه فڕێ بدەم، ئەویش دەڵێت

فرۆشتنی دە، جا ئەگەر دوورتر لەوەی دیاریان کردووە فرۆشتنی دا ئەوا هێندەی ئەوە پارە زیاتر وەردەگرێ، کە ئەم جۆرە مامەڵانەش جائیز نین، واللە اعلم .

**٢٣٢** - ابي هريرة فەرمووی : رسول اللە ﷺ نەهی کرد لە کڕین و فرۆشتنی زیخ و کڕین و فرۆشتنی شتی هەڵخەڵەتێنەر .

**٢٣٣** - ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : رسول اللە ﷺ نەهی کرد لە کڕین و فرۆشتنی شتی هەڵخەڵەتێنەر .

**٢٣٤** - لە أنس بن مالك ـەوە رضي الله عنه : کە رسول اللە ﷺ نەهی کردووە لە کڕین و فرۆشتنی شتی هەڵخەڵەتێنەر .

**٢٣٥** - لە ابي هريرة ـوە رضي الله عنه : رسول اللە ﷺ نەهی کرد لە دەست لێدان - الملامسة - و فڕێدان - المنابذة - .

**٢٣٦** - لە ابي سعيد الخدري ـەوە رضي الله عنه : رسول اللە ﷺ نەهی کرد لە دوو کڕین و فرۆشتن : الملامسة و المنابذة .

**٢٣٧** - ابي سعيد الخدري فەرمووی : رسول اللە ﷺ نەهی کرد لە دوو کڕین و فرۆشتن : الملامسة و المنابذة .

المنابذة : ئەوەیە کە فرۆشیار پێشنیاری جلێك بکات و بڵێ : ئەگەر فرێمدایە لات ئەوا فرۆشتنەکە واجب بووە - واتە هەر دەبێ بیکرِێ - .

وە الملامسة : ئەوەیە کە دەست لە جلەکە بدات و بڵاوی نەکاتەوە و تەماشای نەکات، ئەگەر دەستی لێدا ئەوا فرۆشتنەکە واجب دەبێ - واتە هەر دەستی لێبدا دەبێ بیکرِێ بێ ئەوەی سەیریشی بکات! - .

**٢٣٨** - لە ابن شهابەوە : عامر بن سعد بن ابي وقاص پێی ڕاگەیاندم : کە ابي سعيد الخدري پێی ڕاگەیاندووە : کە رسول الله ﷺ نەهی کردووە لە الملامسة کە الملامسة ئەوەیە : دەست لە جلێك بدات و سەیریشی نەکات، وە دەربارەی المنابذة ئەوەیە : پیاوێك جلێك بۆ پیاوێکی تر فرێبدا بە مەبەستی فرۆشتن پێش ئەوەی تەماشای بکات و سەیریشی بکا .

**٢٣٩** - ابن شهاب وتی : عامر بن سعد بن ابي وقاص پێی ڕاگەیاندم کە ابي سعيد الخدري فەرمووی : رسول الله ﷺ نەهی کردووە لە دوو کرِین و فرۆشتن : نەهی کردووە لە الملامسة و المنابذة لە کرِین و فرۆشتندا . الملامسة بریتیە لە : دەست لێدانی پیاو لە کۆتایی جلێك بە شەو یان بە ڕۆژ، وە تەماشای نەکات ئیللا بەوە نەبێ - والله اعلم دەستکاری ناکات و جوان سەیری ناکات لەم جۆرە کرِین و فرۆشتنەدا - ، وە المنابذة بریتیە لە : پیاوێك جلێك بۆ پیاوێکی تر فرێبدا، و ئەوە ببێتە کرِین و فرۆشتنەکەیان، بە بێ سەیرکردن و ڕەزامەندی .

**٢٤٠** - ابو عبدالله وتی : وه الله عز و جل فەرموویەتی : ﴿**وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ**﴾ **[النساء : ٩٢]**، جا بە موجمەلی باسی خوێنی كردووە، و شاردویەتیەوە و تەفسیری نەكردووە، بەڵكو تەفسیرەكەی بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ داناوە، جا پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بە سوننەتەكەی تەفسیر كردووە، وە خوێنی پیاوێكی موسڵمانی كرد بە سەد حوشتر، و ئەهلی عیلمیش لەسەر ئەو وتەیە رێك كەوتوون .

**٢٤١** - لە عبدالله بن عبدالرحمن بن سهل لە سهل بن ابي حثمة ـەوە رضي الله عنه كە ئەو و پیاوانێك لە گەورەكانی قەومی خۆی پێیان ڕاگەیاندووە : كە عبدالله بن سهل و محيصة دەرچوون بۆ خەیبەر، جا عبدالله بن سهل كوژرا، وە رسول الله ﷺ خوێنەكەی دا، سەد حوشتری بۆ ناردن تاكو كرانە ماڵەكەوە، سهل وتی : حوشترێكی سور لەوانە لە دەستم ڕایكرد .

**٢٤٢** - سهل بن ابي حثمة فەرمووی : عبدالله بن سهل لە خەیبەر كوژرا، جا رسول الله ﷺ خوێنەكەی بە سەد حوشتر دا .

**٢٤٣** - لە بشر بن يسار الأنصاريەوە كە سهل بن ابي حثمة پێی ڕاگەیاندووە كە پێغەمبەر ﷺ سەد حوشتری وەكو خوێن داوە پێی .

**٢٤٤** - له ابو بكر بن محمد بن عمرو بن حزم ەوە لە باوكيەوە لە باپيريەوە : رسول الله ﷺ نامەی نارد بۆ خەڵكی یەمەن كە فەرزەكان و سوننەتەكان و خوێنی تێدا بوو، وە بە عمرو بن حزم دا ناردی، پاشان بەسەر خەڵكی یەمەندا خوێنرایەوە، وە لە نامەكەدا ئەوەی تێدابوو كە لە بەرامبەر نەفسدا سەد حوشتر هەیە - واتە لە بری خوێن - .

**٢٤٥** - الزهري وتی : پەڕەیەكم لای ابي بكر بن محمد بن عمرو بن حزم خوێندەوە، باسی ئەوەی كرد كە رسول الله ﷺ نوسیبووی بۆ عمرو بن حزم، تێیدا هاتبوو : ئەمە كتێبی برینەكانە : لە بەرامبەر نەفسدا : سەد حوشتر هەیە، وە لە بەرامبەر لوتدا ئەگەر قرتێنرابوو : سەد حوشتر هەیە، وە لە بەرامبەر چاودا : پەنجا حوشتر، وە لە بەرامبەر گوێ : پەنجا حوشتر، و لە بەرامبەر قاچ : پەنجا حوشتر .

**٢٤٦** - لە عبدالله و محمدەوە كە كوڕی ابي بكر بن محمد بن عمر و بن حزم ن دەگێڕنەوە لە باوكیانەوە لە باپیریانەوە لە رسول الله وە ﷺ : كە ئەم نامەیەی بۆ عمرو بن حزم نوسی كاتێك ناردی بۆ یەمەن، لە نامەكەدا نوسیبووی : لە بەرامبەر نەفسی ئیماندار : سەد حوشتر هەیە، وە لە بەرامبەر لوت ئەگەر قرتێنرابێ : سەد حوشتر هەیە، وە لە بەرامبەر دەست : پەنجا

حوشتر، و لە بەرامبەر قاچ : پەنجا حوشتر، و لە بەرامبەر چاو : پەنجا حوشتر .

**٢٤٧** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەموو شتێکی گەورەکراو لە سەردەمی جاهیلیدا کە باس لە خوێن، یان ماڵ بکا ئەوا لە ژێر پێمدایە، تەنها ئاودان بە حاجیەکان و داپۆشینی کەعبە نەبێ) .

پاشان فەرمووی : (لە بەرامبەر خوێن بۆ کوشتن بە هەڵە کە لە ئەنقەست بچێ بە قامچی بێت یان بە دار : سەد حوشتر هەیە، لەو سەد دانەیە - دەبێ - چل دانەیان بێچوو لە سکیاندا بێ) .

---

: واتە کەسێك بە هەڵە بە قامچی یان بە دار کەسێك دەکوژێ کە ئەم کوشتنە لە کوشتنی ئەنقەست دەچێ، لە بەرامبەر خوێنەکەیدا سەد حوشتر هەیە کە چلیان دەبێ بێچوو لە سکیاندا هەبێ .

**٢٤٨** - لە عقبة بن أوس السدوسي ەوە لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە : کە رسول الله ﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا وتاری دا و فەرمووی : (سوپاس بۆ ئەو الله یەی کە بەڵێنەکەی بردە سەر، و بەندەکەی سەرخست، و بە تەنها حیزبەکانی بەزاند، هەموو شتێکی گەورەکراو لە سەردەمی جاهیلیدا کە باس لە

خوێن، یان دەعوا بکا ئەوا لە ژێر هەردوو پێمدا دانراوە، تەنها داپۆشینی کەعبە و ئاودان بە حاجیەکان نەبێ، کوژراوی هەڵە کە وەکو ئەنقەست وابێ بە قامچی یان دار یان بەرد لە بەرامبەریدا خوێن هەیە، خوێندانێکی توند : کە سەد حوشترە، و تێیاندا چل حوشتر هەبێ کە بێچوو لە سکیاندا بێ) .

**٢٤٩** - محمد بن عمرو بن علقمة وتی : عمر بن عبدالعزیز نامەیەکی دەربارەی خوێن نوسی، لە نامەکەدا باسی کردبوو : خوێنی موسڵمانێك لە سەردەمی رسول الله ﷺ سەد حوشتر بوو، جا عمر بن الخطاب لەسەر دانیشتوانی دێیەکان نرخەکەی بە هەزار دینار دانا، یان دوانزە هەزار درهەم، وە خوێنی ئافرەتێکی ئازادی موسڵمان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پەنجا حوشتر بوو، عمر بن الخطاب لەسەر دانیشتوانی دێیەکان نرخەکەی بە پێنج سەد دینار دانا، یان شەش هەزار درهەم .

**٢٥٠** - ابو عبدالله وتی : الله تبارك و تعالی فەرمووی : ﴿**إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ**﴾ [**الطلاق** : ١]، جا پێغەمبەر ﷺ بە سوننەتەکەی تەفسیری ئەو عیددەیەی کردووە کە الله فەرمانی پێکردووە ئافرەتانی تێدا تەڵاق بدرێ .

**٢٥١** - لە نافع ەوە لە ابن عمر ەوە رضي الله عنهما : کە لە سەردەمی رسول الله دا ﷺ ژنەکەی تەڵاق دا لە کاتێکدا لە سوڕی مانگانەدا بوو، جا عمر بن الخطاب سەبارەت بەوە پرسیاری لە رسول الله ﷺ کرد، رسول الله ﷺ

فەرمووی : (پێی بڵێ با بیگەڕێنێتەوە پاشان بیهێڵێتەوە تا پاك دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتەوە سوڕی مانگانەوە پاشان پاك دەبێتەوە، جا ئەگەر ویستی ئەوا لێی دەگەڕێ و تەڵاقی نادا، وە ئەگەر ویستی تەڵاقی بدا ئەوا با لە کاتی پاك بوونەوە تەڵاقی بدا پێش ئەوەی جیماعی لەگەڵ بکا، ئەمەش ئەو عیددەیەیە کە الله فەرمانی پێ کردووە ئافرەتانی تێدا تەڵاق بدرێت) .

**٢٥٢** - لە نافع ـەوە لە عبدالله ـوە : کە ژنێکی تەڵاق دا بە یەك تەڵاق دان لە کاتێکدا لە سوڕی مانگانەدا بوو، بۆیە رسول الله ﷺ فەرمانی کرد بیگەڕێنێتەوە پاشان بیهێڵێتەوە هەتا پاك دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتە سوڕێکی دیکەی مانگانەوە پاشان لێی دەگەڕێ هەتا لە سوڕی مانگانەکەی پاك دەبێتەوە، جا ئەگەر ویستی تەڵاقی بدا، ئەوا با لە کاتی پاك بوونەوە تەڵاقی بدا پێش ئەوەی جیماعی لەگەڵ بکا، ئەمەش ئەو عیدەیەیە کە الله فەرمانی کردووە ئافرەتانی تێدا تەڵاق بدرێ .

**٢٥٣** - ابو عبدالله وتی : جا ئەمە تەفسیری ڕووی یەکەمی سوننەتەکان بوو کە تەفسیری ئەو شتانەیە کە الله لە کتێبەکەیدا بە موجمەلی فەرزی کردووە، بە پێی پێویست باسم لێیان کرد، وە ئەهلی تێگەیشتن بەڵگەی پێ دەهێننەوە لەسەر ئەوەی کە لە دوای ئەمە دێ کە هێشتا باسم نەکردووە ان شاء الله .

## باسكردنى ڕووى دووەمى سوننەتەكان كە زانایان جیاواز بوون لەوەى : كە ئایا نەسخ كەرەوەى هەندێك لە حوكمەكانى قورئانە یان ڕوون كەرەوەى تایبەت و گشتیەتى؟

**٢٥٤** - خەڵكى دەربارەى سوننەت جیاوازیان تێكەوت : ئایا قورئان نەسخ دەكاتەوە یان نا؟ كۆمەڵێك لە زانایان وتیان : سوننەت قورئان نەسخ ناكاتەوە، وە هیچ قورئان نەسخ ناكاتەوە جگە لە قورئان، بەڵكو سوننەت قورئان ڕوون دەكاتەوە و تەفسیرى موجمەلەكەى دەكات، وە تایبەت و گشتیەكەى ڕوون دەكاتەوە، وە فەرزەكان و حوكمەكان زیاد دەكات بەڵام قورئان نەسخ ناكاتەوە، جا بەڵگەیان هێنایەوە بە فەرمایشتى الله تبارك و تعالى : ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ﴾ [**البقرة** : ١٠٦] .

وە بە فەرمایشتى : ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ﴾ [**النحل** : ١٠١] .

وە بە فەرمایشتى : ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِيَ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآيِٕ نَفْسِيَ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ [**یونس** : ١٥] .

ئەمەش مەزهەبى الشافعي و هاوەڵانیەتى .

وە کۆمەڵێکی تر وتیان : دەکرێ سوننەت قورئان نەسخ کاتەوە، ئەویش بەوە دەبێ کە الله تبارك و تعالى حوکمێك بدات لە کتێبەکەیدا، پاشان وەحی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ بنێرێ بەوەی کە ئەو حوکمەی نەسخ کردۆتەوە و فەرمان بە جیاواز لەو حوکمە بکات، جا پێغەمبەریش ﷺ بەوە فەرمان بە خەڵکی بکا، وە بۆ ئەوەش الله قورئان دانابەزێنێ تا بخوێنرێتەوە، وە خەڵکیش لەسەریانە کە پێغەمبەر ﷺ بە ڕاست بخەنەوە و ئەوەی لێ قبوڵ بکەن، وە بشزانن کە پێغەمبەر ﷺ نەسخی ئەوەی نەکردۆتەوە کە الله دایبەزاندووە ئیللا بە وەحی نەبێ لە الله وە، ئەگەر چی قورئانێکیش نەبێ بخوێنرێتەوە؛ لەبەر فەرمایشتی الله عز و جل : ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ (٣) إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ (٤)﴾ [النجم] .

وە فەرمایشتی : ﴿إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ [الأنعام : ٥٠] .

جا وەحی هەیە کە قورئانە، وەحیش هەیە قورئان نییە، کە الله عز و جل فەرموویەتی : ﴿مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ﴾ [البقرة : ١٠٦] نەیفەرمووە : ئایەتێکی باشتر دەهێنین و نەشی فەرمووە قورئانێکی باشتر دەهێنین .

**٢٥٥** - وە ابو قدامة بۆی باسکردین وتی : گوێم لە سفيان بن عيينة بوو دەیوت : ئەم ئایەتەم دەخوێندەوە و تێی نەدەگەیشتم : ﴿مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ

نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ﴾ [البقرة : ١٠٦]، دەموت : ئەمەیان قورئانە، و ئەوەی تریش هەر قورئانە، کەواتە چۆن باشترە لەمەیان؟! تاکو بۆم ڕوون کرایەوە، و ڕوون بوو : - واتاکەی ئەوەبوو کە - باشتر دەهێنین بۆ ئێوە، ئاسانتر لەسەرتان، کەمتر لەسەرتان، ئەهوەنتر لەسەرتان .

---

: واتە کاتێك الله فەرموویەتی : هیچ ئایەتێك نەسخ ناکەینەوە ئیللا باشتر دەهێنین یان هاوشێوەی ئەو، سفیان بن عیینة تێ نەگەیشتووە کە ئایا چۆن قورئان باشتر دەبێ لە قورئان؟ بەڵام مەبەست لەوە بووە کە ئەو حوکمەی لە ئایەتە نوێیەکەیان هەیە باشتر بێ بۆ ئێمە و ئاسانتر و ئەهوەنتر بێ لەسەرمان وەك لەوەی پێشووتر .

٢٥٦ - **ابو عبدالله** وتی : جا لێکدانەوەی ئایەتەکە لای ئەهلی عیلم بەو شێوەیەیە کە ابن عیینة وتی، وتیان : واتای نەسخ بریتیە لەوەی : الله ئەو حوکمەی سەرەتای کە بە کەلامەکەی واجبی کردبوو نەسخی بکاتەوە بە حوکمی باشتر بۆیان، بەم شێوەیەیە ئاسانی کردووە لەسەر بەندەکانی، بۆیانی گۆڕیوە بە کردەوەیەکی ئاسانتر لەوەی یەکەم لەسەریان، وە حوکمێکی باشتری بۆیان ویستووە لە حوکمی ئایەتەکەی یەکەم، فراوانتر و ئاسانترە لەسەریان، هەروەکو ئەوەی شەونوێژی نەسخ کردەوە بۆیان بەوەی کە لە توانایاندا هەیە، جا ئەوەی کە لە توانایاندا هەیە لە ڕووی فراوانی و ئاسانییەوە باشترە بۆیان لە

ماندوویەتی لەسەریان بە درێژایی شەو بۆ شەونوێژ؛ لەبەر ئەوەی ئەوەندەیان نوێژ کرد هەتا پێیەکانیان هەڵئاوسابوو، بۆیە الله ئەوەی لەسەر ئاسان کردن - دیارە شەونوێژ پێشتر فەرز بووە بەڵام الله بۆیانی دانا بەو ڕادەیەی کە لە توانایاندا هەیە هەروەکو لە کۆتا ئایەتی سورەتی المزمل هاتووە، والله اعلم - .

وە بە هەمان شێوە ئەوان بە تایبەتی قسە و چپەیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نەدەکرد هەتاوەکو صەدەقەیەك نەکەن، جا الله ئەوەی لەسەر ئاسان کردن - بڕواننە ئایەتی ١٢ و ١٣ لە سورەتی المجادلة - .

وە دەکرێ نەسخ کەرەوەکە - الناسخ - باشتر بێ بۆیان، بەوەی کە پاداشتەکەی لەسەری زیاتر بێ ئەگەر ئەوان کاری پێ بکەن، وە باشتر بێ بۆیان لە عاقیبەتدا، وتیان : دەکرێ ڕوون کردنەوەی حوکمی دووەم کە جێگرەوەی حوکمی یەکەمە لە کتێبەکەیدا دابەزێنرابێ، وە دەشکرێ ڕوون کردنەوەی ئەوە بخاتە سەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ و لە کتێبەکەیدا داینەبەزێنێ .

---

: واتە ئەم کۆمەڵەیە وتیان : دەکرێ بە ئایەت نەسخی ئایەت بکاتەوە، و دەشکرێ بە سوننەت نەسخی بکاتەوە، ئەو کات یان الله خۆی لە کتێبەکەی تەفسیری حوکمەکە دەکات یان دایدەنێ پێغەمبەر ﷺ تەفسیری بکات .

**٢٥٧** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئاگادار بن من کتێبم پێدراوە - واتە قورئان - لەگەڵ هاوشێوەکەیدا، ئاگادار بن من قورئانم پێدراوە لەگەڵ هاوشێوەکەیدا، ئاگادار بن پێدەچێ پیاوێکی تێر کە پاڵی دابێتەوە بە قەنەفەکەیەوە بڵێ : دەست بگرن بە قورئانەوە، هەر چیتان تێیدا بینی حەلاڵ بوو بە حەلاڵی بزانن، وە هەر چیتان تێیدا بینی حەرام بوو بە حەرامی بزانن، ئاگادار بن گۆشتی کەری ماڵی بۆتان حەلاڵ نییە لەگەڵ هەموو کەڵبەدارێکی دڕندە لە ئاژەلان) .

**٢٥٨** - لە الحسن بن جابرەوە وتی : گوێم لە المقدام بن معدي كرب بوو رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا شتانێکی حەرام کرد، پاشان فەرمووی : (پێدەچێ پیاوێك کە پاڵی دابێتەوە بە قەنەفەکەیەوە و فەرموودەیەکی منی بۆ باس بکرێ و بڵێ : کتێبی الله تان پێ ڕادەگەیەنم، هەر چیمان لە حەلاڵ تێیدا بینی بە حەلاڵی دەزانین، و هەر چیمان لە حەرام تێیدا بینی بە حەرامی دەزانین، ئاگادار بن ئەوەی رسول الله ﷺ حەرامی کردبێت هاوشێوەی ئەوەیە کە الله حەرامی کردووە) .

**٢٥٩** - **ابو عبدالله** وتی : وە لەوەی کە ئەم دوو کۆمەڵەیە جیاوازیان تێکەوت ئەوا فەرزبوونەکەی جێگیر بووە لە قورئاندا، وە کۆدەنگن لەسەر

نەسخ بوونی، بەڵام جیاوازن لەوەی کە ئاخۆ چی نەسخی کردۆتەوە: قورئان یان سوننەت؟!

فەرمایشتی الله عز و جل: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾ [البقرة: ١٨٠].

جا هەردوو کۆمەڵەکە کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە واجب بوونی وەسێت لە لایەن میراتگرەوە بۆ خزمەکانی نەسخ بۆتەوە - واتە پێشتر وەسێت واجب بووە بەڵام دواتر نەسخ بۆتەوە - ، پاشان جیاوازیان تێکەوت - لەسەر ئەوەی چی نەسخی کردۆتەوە - ، ئەو کۆمەڵەیەی کە پێیان وابوو کە دەکرێ قورئان بە سوننەت نەسخ بێتەوە وتیان: وەسێتی ئەو بۆیان بە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ نەسخ بۆتەوە کە فەرموویەتی:

**٢٦٠** - (میراتگر هیچ وەسێتێکی بۆ نییە).

**٢٦١** - وە کۆمەڵەکەی تر وتیان: بەڵکو فەریزەی میرات لە کتێبی الله دا وەسێتی بۆ ئەوان نەسخ کردۆتەوە، تەنها ئەوە نەبێ کە پێغەمبەر ﷺ ڕوون کەرەوە بووە بۆی بەو فەرمایشتەی کە فەرموویەتی: (میراتگر هیچ وەسێتێکی بۆ نییە)، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە دەکرا وەسێت بۆیان جێگیر بێ لەگەڵ میراتدا، وە دەشکرا میرات نەسخی وەسێتی کردبێتەوە، بۆیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (میراتگر هیچ وەسێتێکی بۆ نییە) ئەمە دەلالەتی لەوە کرد کە میرات

نەسخی وەسێتی كردۆتەوە، نەك ئەوەی كە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ نەسخی وەسێتی بۆیان كردبێتەوە - واتە ئەم كۆمەڵەیە دەڵێن كە الله باسی فەریزەی میراتی كرد دەكرا وەسێتیش بەشێك بوایە لە فەریزەی میرات وە دەشكرا نەسخ بوبێتەوە، جا پێغەمبەریش ﷺ بەوەی كە فەرموویەتی : (میراتگر هیچ وەسێتێكی بۆ نییە) تەنها ڕوونی كردۆتەوە نەك ئەوەی وەسێتی نەسخ كردبێتەوە - .

بۆیە كۆمەڵەكەی تر وتیان : ئەمانە لە فەریزەی میراتدا هیچ بەڵگەیەكیان نییە لەسەر نەسخ بوونەوەی وەسێت بۆیان, بەڵكو لە ئایەتی میراتدا بەڵگە هەیە لەسەر جێگیر بوونی وەسێت بۆیان، چونكە الله تبارك و تعالى میراتی فەرز كرد ڕایگەیاند كە فەرزی كردووە لە دوای وەسێت كردنەوە، هەروەكو بە دوای فەریزەی میراتدا فەرموویەتی : ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ **[النساء : ١١]**، جا ئەگەر بە پێی ڕووكەشی قورئان بوایە ئەوا دەبوو ئەگەر مردوو دەستی بكردایە بە وەسێت بۆ دایك و باوك و باقی میراتگرانی : ئەوا دەستی پێبكردایە بە وەسێت پێدانیان، پاشان میراتەكانیان پێ بدرێ لە دوای وەسێتەكەوە؛ لەبەر فەرمایشتی : ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾، وتیان : بۆیە سوننەت نەسخ كەرەوەی واجب بوونی وەسێتە نەك شتێكی تر، كە ئەویش ئەم فەرمایشتەیە : (میراتگر هیچ وەسێتێكی بۆ نییە) .

وتیان : وە ڕووكەشی قورئان جائیز بوونی وەسێتی بۆ غەیری میراتگر واجب كردووە، ئەگەر بۆ سەر هەموو ماڵ و سامانەكەش بێ؛ چونكە میرات لە دوای

وەسێتەوە فەرز کرا، بەڵام دیاری نەکردووە ئاخۆ سێیەکە یان کەمتر یان زیاترە، جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ حوکمی بەوە نەدایە کە وەسێت جائیز نییە زیاتر بێ لە سێیەك، ئەوا بە پێی ڕووکەش و گشتی قورئان وەسێت جائیز دەبوو زیاتر بێ لە سێیەك، بەڵام سوننەت هات بە دیاری کردنی وەسێت بۆ سێیەك .

**٢٦٢** - لە عامر بن سعد ەوە لە باوکیەوە رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ سەردانی کردم لە حەجی ماڵئاواییدا ئەوکاتەی بەهۆی نەخۆشییەك کە نزیك بوومەوە لە مردن، وتم : یا رسول الله ﷺ، ئەوەی کە لە نەخۆشیەکەمدا دەیبینی پێمی ڕابگەیەنە، من خاوەن ماڵ و سامانم، کەسیش نییە میراتم لێ بگرێتەوە تەنها یەك کچم نەبێ، ئایا دوو لەسەر سێی ماڵەکەم نەبەخشم؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی نیوەی نەبەخشم؟

فەرمووی : (نا، سێیەك، بەڵام سێیەك زۆرە، تۆ ئەگەر ئەو کەسانەی میراتت لێ دەگرنەوە بە دەوڵەمەندی جێیان بهێڵی باشترە لەوەی بیانکەیتە هەژار و دەست لە خەڵکی پان بکەنەوە، وە تۆ هیچ شتێك نابەخشی و بۆ ڕەزامەندی الله بەخشیبێتت ئیللا پاداشتت دەدرێتەوە پێی، تەنانەت ئەو تیکەیەش کە دەیکەیتە دەمی ژنەکەتەوە) .

**٢٦٣** - له عامر بن سعد بن ابي وقاص ەوە له باوكيەوە فەرمووى: لەگەڵ رسول الله ﷺ بووم له حەجى ماڵئاواييدا، جا نەخۆش كەوتم بە نەخۆشييەك كە نزيك بوومەوە لە مردن، بۆيە رسول الله ﷺ سەردانى كردم، وتم: يا رسول الله ﷺ، سامانەكەم زۆرە، وە كەس ميراتم لێ ناگرێ تەنها كچێكم نەبێ، ئايا وەسێت بكەم بە دوو لەسەر سێى سامانەكەم - واتە بە بەخشينى - ؟

فەرمووى: (نەخێر).

وتم: ئەى بە نيوەى سامانەكەم؟

فەرمووى: (نەخێر).

وتم: ئەى سێيەكى سامانەكەم؟

فەرمووى: (سێيەك زۆرە، ئەى سعد تۆ ئەگەر ئەو كەسانەى ميراتت لێ دەگرن بە دەوڵەمەندى بيانهێڵيتەوە، باشترە لەوەى بيانكەيتە هەژار و دەست لە خەڵكى پان بكەنەوە).

**٢٦٤** - الزهري بەم اسنادە وەكو ئەمەى گێڕاوەتەوە.

**٢٦٥** - له مصعب بن سعد ەوە لە باوكيەوە فەرمووى: پێغەمبەر ﷺ سەردانى كردم، پێم وت: وەسيەت بكەم بە - بەخشينى - هەموو سامانەكەم؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی بە نیوەی؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی بە سێیەکی؟

فەرمووی : (بەڵێ، وە سێیەك زۆرە یان فەرمووی گەورەیە) .

**٢٦٦** - لە مصعب بن سعد ەوە لە باوکیەوە فەرمووی : رسول اللە ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام و من نەخۆش بووم و سەردانی کرد، وتم : یا رسول اللە ﷺ، وەسیەت بکەم بە هەموو سامانەکەم؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی بە دوو لەسەر سێ؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی بە نیوەی؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی بە سێیەکی؟ جا بێدەنگ بوو .

**٢٦٧** - سماك بن حرب له مصعب بن سعد له باوكيەوە، ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، وە وتی : رسول الله ﷺ بێدەنگ بوو لە سێیەكدا .

**٢٦٨** - لە محمد بن سعد لە باوكیەوە كە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای لە كە لە مەككە بوو وە لەو كاتەدا تەنها یەك كچی هەبوو، وتم : یا رسول الله ﷺ، من تەنها یەك كچم هەیە، ئایا وەسیەت بكەم بە - بەخشینی - هەموو سامانەكەم؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی بە نیوەی؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی سێیەك؟

فەرمووی : (سێیەك، وە سێیەكیش زۆرە) .

**٢٦٩** - عائشة بنت سعد وتی : سعد رضي الله عنه فەرمووی : لە مەككە توشی نەخۆشییەكی سەخت بووم، بۆیە رسول الله ﷺ هات بۆ سەردانم، وتم : یا رسول الله ﷺ، من سامانێكی زۆرم جێهێشتووە، و تەنها یەك كچم هەیە، ئایا وەسێت بە دوو لەسەر سێی سامانەكەم بكەم، سێیەكێشی بۆ ئەو جێبهێڵم؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی وەسێت بە نیوەی بکەم، و نیوەی بۆ ئەو بە جێبهێڵم؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی وەسێت بە سێیەکی بکەم، و دوو لەسەر سێی بۆ ئەو جێبهێڵم؟

فەرمووی : (سێیەك، وە سێیەکیش زۆرە، سێ جار ئاوای فەرموو) وە دەستی لەسەر ناوچاوانم دانا، و فەرمووی : (یا اللّٰه شیفای سعد بدە، و هیجرەتەکەی بۆ تەواو بکە) .

وتی : هەتا ئەم کاتەش هەست بە ساردی دەستی دەکەم .

**٢٧٠** - لە سعد ەوە کە پێغەمبەر ﷺ سەردانی کرد لە کاتی نەخۆشییەکەیدا، وتی : یا رسول اللّٰه ﷺ، وەسیەت بکەم بە هەموو سامانەکەم؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی بە نیوە؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتم : ئەی بە سێیەك؟

فەرمووی : (سێیەك، وە سێیەكیش زۆرە یان فەرمووی گەورەیە) .

**٢٧١** - لە ابي عبدالرحمن السلمي ەوە لە سعد بن ابي وقاص ەوە فەرمووی : رسول الله ﷺ سەردانی كردم لە كاتی نەخۆشییەكەمدا، فەرمووی : (وەسیەتت كرد؟) .

وتم : بەڵێ .

فەرمووی : (بە چەند؟) .

وتم : بە هەموو سامانەكەم لە پێناوی الله .

فەرمووی : (ئەی چیت جێهێشتووە بۆ منداڵەكانت؟) .

وتم : ئەوان دەوڵەمەندن .

فەرمووی : (وەسیەت بكە بە یەك لەسەر دە) جا بەردەوام دەیوت و منیش دەموت، هەتا فەرمووی : (وەسیەت بكە بە سێیەك، وە سێیەكیش زۆرە) .

ابو عبدالرحمن وتی : ئێمە پێمان خۆشە لە سێیەك كەم بكەینەوە، لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : (وە سێیەكیش زۆرە) .

**٢٧٢** - ابو الأحوص لە عطاء بن السائب بەم اسنادە هەمان شتی گێڕاوەتەوە، وە فەرمووی : بەردەوام لێی كەم دەكردمەوە و لێم كەم دەكردەوە .

**٢٧٣** - سعد بن مالك له پێغەمبەرەوە ﷺ وەکو ئەمەی گێڕاوەتەوە .

**٢٧٤** - ابو عبدالرحمن له سعد ەوە رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ سەردانی کردم کە لەمەککە بووم، فەرمووی : (وەسێتت کردووە؟) .

وتم : بەڵێ، بە هەموو سامانەکەم بۆ فەقیر و هەژاران .

فەرمووی : (وەسێت بکە بە یەك لەسەر دەی سامانەکەت) .

وتم : ئەوانەی میراتم لێ دەگرن دەوڵەمەندن .

فەرمووی : (وەسێت بکە بە یەك لەسەر دە)، جا هەر لێی کەم دەکردمەوە و منیش لێم کەم دەکردەوە .

فەرمووی : (وەسێت بکە بە سێیەکێ، وە سێیەکیش گەورەیە) .

ابو عبدالرحمن وتی : پێیان ناخۆش بوو وەسێت بە سێیەك بکرێ، لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : (وە سێیەکیش زۆرە) .

**٢٧٥** - عمرو بن القارئ له باوکیەوە لە باپیریەوە عمرو بن القارئ : رسول الله ﷺ هات، و سعد نەخۆش کەوت و مایەوە لەو کاتەی کە دەرچوون بۆ خەیبەر، جا کە هات بۆ الجعرانة وەکو سەردان چوو بۆ لای و نەخۆشی بەسەریدا زاڵ بووبوو، وتی : یا رسول الله ﷺ، من سامانێکم هەیە و وە من ماڵ

و منداڵ جێ ناهێڵم، ئایا وەسێت بکەم بە هەموو سامانەکەم، یان هەمووی ببەخشم؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتی : ئایا وەسێت بکەم بە دوو لەسەر سێی؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتی : وەسێت بکەم بە نیوەی؟

فەرمووی : (نەخێر) .

وتی : وەسێت بکەم بە سێیەکی؟

فەرمووی : (سێیەك، وە سێیەکیش زۆرە، یان فەرمووی گەورەیە) .

**٢٧٦** - لە عمران بن حصین ـەوە رضي الله عنه : کە پیاوێك شەش کۆیلەی ئازاد کرد لەسەرە مەرگیدا، کە جگە لەوان هیچ سامانێکی تری نەبوو، رسول الله ش ﷺ بانگی کردن و کردنی بە سێ بەشەوە، پاشان تیر و پشکی لە نێوانیان کرد، جا دوانیانی ئازاد کرد، وە چواریانی هێشتەوە وەکو کۆیلە، وە لە بارەی ئەوەوە وتەیەکی توندی فەرموو .

**٢٧٧** - لە عمران بن حصین ـەوە رضي الله عنه : کە پیاوێك شەش کۆیلەی ئازاد کرد لەسەرە مەرگیدا وە جگە لەوان هیچ سامانێکی جێنەهێشتبوو،

ئەمەش گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ، وە تووڕە بوو و فەرمووی : (ویستم نوێژی لەسەر نەکەم)، بانگی کردن و کردنی بە سێ بەشەوە، پاشان تیر و پشکی لە نێوانیان کرد، جا دوانیانی ئازاد کرد وە چواریانی هێشتەوە وەکو کۆیلە .

جا لە فەرموودەی عمران بەڵگە هەیە لەسەر پووچەڵی وەسێتێك کە لە سێیەك تێبپەڕێت، جا ئەو کۆمەڵەیەی کە پێیان جائیز بوو قورئان بە سوننەت نەسخ ببێتەوە وتیان : ئەوە سوننەت بوو کە نەسخی ئەو وەسێتەی کردەوە کە لە سێیەك تێدەپەڕێ و بە پووچەڵی دانا، وە کۆمەڵەکەی تر وتیان : سوننەت هیچی لە قورئان نەسخ نەکردۆتەوە، بەڵکو تایبەت و گشتی قورئانی ڕوون کردۆتەوە، وە الله بەم فەرمایشتەی : ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَا﴾ [النساء : ١٢] مەبەستی لە هەندێك وەسێت بووە و مەبەستی لە هەندێکی تر نەبووە، مەبەستی لەو وەسێتانە بووە کە کەمترن لە سێیەك هەتا سێیەك، وە بەم فەرمایشتەی : ﴿أَوْ دَيْنٍ﴾ هەموو قەرزێك بووە بە گشتی، نەك بە تایبەتی، وە لە کتێبەکەیدا دەستی کردووە بە باسکردنی وەسێت لە پێش قەرزەوە، وە پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە کە قەرز دەستی پێ دەکرێ لە پێش وەسێتەوە لە هەموو ساماندا، پاشان وەسێت لە دوای قەرزەوە، جا لە سێیەك دەری کردووە، وە زانایانیش لەسەر کار کردن بەوە ڕێك کەوتوون هەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ تاکو ئەمڕۆمان، کارکردن بەوە جێ دەهێڵن سەدە لە دوای سەدەوە، هیچ جیاوازیشیان دەربارەی نییە .

: والله اعلم، مەبەستى ئەوەیە دەبێ قەرزى کەسەکە بدرێتەوە ئینجا ئەو وەسیەتە جێبەجێ بکرێ کە کردویەتى بۆ بەخشینى بەشێك لە سامانەکەى .

**٢٧٨** - علي رضي الله عنه فەرمووى : رسول الله ﷺ بڕیارى بە قەرز دا لە پێش وەسێتەوە ئێوەش دەیخوێننەوە : ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ **[النساء : ١٢]**، وە ئەو برایانەى لە دایك و باوکیەوەن میرات دەگرن و ئەوانەى لە باوکیەوەن میرات ناگرن .

**٢٧٩** - علي بن ابي طالب فەرمووى : ئێوە ئایەتى : ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ **[النساء : ١٢]** دەخوێننەوە، وە رسول الله ﷺ بڕیارى بە قەرز دا لە پێش وەسێتەوە، وە ئەو برایانەى لە دایك و باوکیەوەن میرات دەگرن و ئەوانەى لە باوکیەوەن میرات ناگرن، پیاو میرات بە جێ دەهێڵێ بۆ ئەو برایەى کە لە دایك و باوکیەوەتى بەڵام بۆ ئەو برایەى جێ ناهێڵێ کە لە باوکیەوەیەتى .

: والله اعلم، بۆ نمونە کەسێك دەمرێ برایەکى هەیە کە لە دایك و باوکى خۆیەتى، وە برایەکى هەیە کە لە باوکێتى و لە دایکى خۆى نییە، ئەوا ئەو برایەى کە لە دایك و باوکێتى میراتى لێ دەگرێ بەڵام ئەوەى تر کە تەنها لە باوکێتى میراتى لێ ناگرێ .

**٢٨٠ - ابو عبدالله** وتى : الله عز و جل فەرموويەتى : ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا (٢٢) حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ﴾ **[النساء : ٢٢ و ٢٣]** تا كۆتايی هەموو ئايەتەكە .

**٢٨١ -** ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : حەوت دانەتان لە ڕەچەڵەك لەسەر حەرام كراوە، لەگەڵ حەوت دانە لە ژن و ژن خوازیەوە .

**٢٨٢ -** ابن عباس فەرمووی : حەوت دانەتان لە ڕەچەڵەك لەسەر حەرام كراوە، لەگەڵ حەوت دانە لە ژن و ژن خوازیەوە، ئەوەی لە ڕەچەڵەكەوەیە : ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ﴾ **[النساء : ٢٣]** ئەمەیان ڕەچەڵەك بوو .

وە ئەوەی لە ژن و ژن خوازیەوە : ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ **[النساء : ٢٢]** .

**٢٨٣ -** لە عمرو بن سالم مولى الأنصار ـەوە : الله حەوتی لە ڕەچەڵەك حەرام كردووە، لەگەڵ حەوت لە ژن و ژن خوازی، فەرموویەتی : ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ﴾ **[النساء : ٢٣]**، وە لە ژن و ژن خوازیدا : ﴿وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ﴾ **[النساء : ٢٣]** .

**٢٨٤ - ابو عبدالله** وتی : الله عز و جل لە ئایەتەكەدا كۆكردنەوەی نێوان دوو خوشكی حەرام كرد - واتە لە یەك كاتدا دوو خوشك نابێ هاوسەری یەك پیاو بن -

بەڵام کۆکردنەوەی نێوان دوو ئافرەتی غەیری خوشك حەرام نەکرد، پاشان فەرمووی : ﴿وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ﴾ [النساء : ٢٤]، جا سوننەت کۆکردنەوەی نێوان ئافرەتێك و پوری لە باوکیەوە حەرام کرد، لەگەڵ ئافرەتەکە و پوری لە دایکیەوە .

---

: واتە نابێ ئافرەتێك و پوری ئافرەتەکە لە یەك کاتدا هاوسەری پیاوێك بن، جا پوری بێت لە باوکیەوە یان لە دایکیەوە هەمان شتە، حەرام بوونی ئەمەش لە قورئاندا نەهاتووە تەنها لە سوننەت هاتووە .

**٢٨٥** - ابي هريرة رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ نەهی کردووە لەوەی ئافرەتێك مارە بکرێ بەسەر پوری لە باوکیەوە یان پوری لە دایکیەوە .

**٢٨٦** - ابي هريرة فەرمووی : رسول الله ﷺ نەهی کرد لە کۆکردنەوەی نێوان ئافرەتێك و پوری لە باوکیەوە یان ئافرەتەکە و پوری لە دایکیەوە .

**٢٨٧** - الأعرج لە ابو هريرة وە فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (پیاو نابێ نێوان ئافرەتێك و پوری لە باوکیەوە کۆبکاتەوە، لەگەڵ ئافرەتەکە و پوری لە دایکیەوە) .

عراك بن مالك لە ابو هريرة وە هەمان شتی گێڕاوەتەوە .

**٢٨٨** - له رسول الله وه ﷺ : كه نه‌هی كردووه له‌وه‌ی ئافره‌تێك ماره بكرێ به‌سه‌ر پوری له باوكیه‌وه یان پوری له دایكیه‌وه .

**٢٨٩** - له الشعبي له ابو هريرة وه، هه‌روه‌ها له الشعبي له جابر بن عبدالله وه رضي الله عنهما له رسول الله وه ﷺ فه‌رمووی : (ئافره‌ت ماره ناكرێ به‌سه‌ر پوری له باوكیه‌وه، وه پوریش ماره ناكرێ به‌سه‌ر كچی براكه‌یه‌وه، وه كچی خوشك ماره ناكرێ به‌سه‌ر پوریه‌وه، وه پوریش ماره ناكرێ به‌سه‌ر كچی خوشكیه‌وه، وه كچی گه‌وره ماره ناكرێ به‌سه‌ر كچی بچوك، وه كچی بچوك ماره ناكرێ به‌سه‌ر كچی گه‌وره) .

**٢٩٠** - رسول الله ﷺ فه‌رمووی : (ئافره‌ت ماره ناكرێ به‌سه‌ر پوری له باوكیه‌وه، وه به‌سه‌ر پوری له دایكیه‌وه) .

**٢٩١** - عاصم وتی : كتێبێكم نیشانی الشعبي دا كه تێیدا هاتبوو : له جابر بن عبدالله وه له رسول الله وه ﷺ : كه نه‌هی كردووه له ماره كردنی ئافره‌ت به‌سه‌ر پوری له باوكیه‌وه یان پوری له دایكیه‌وه، الشعبي وتی : من ئه‌وه‌م له جابر بن عبدالله رضي الله عنه بیستووه .

**٢٩٢** - ابي سعيد الخدري رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ نەهی کرد لە دوو نیکاح : ئەوەی کە نێوانی ئافرەت و پوری لە باوکیەوە کۆبکرێتەوە، لەگەڵ نێوانی ئافرەت و پوری لە دایکیەوە .

**٢٩٣** - ابي سعيد الخدري فەرمووی : رسول الله ﷺ نەهی کرد لە کۆکردنەوەی نێوان ئافرەت و پوری لە باوکیەوە، وە نێوان ئافرەت و پوری لە دایکیەوە، بە نیکاح .

**٢٩٤** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئافرەت مارە ناکرێ بەسەر پوری لە باوکیەوە، وە بەسەر پوری لە دایکیەوە) .

**٢٩٥** - لە عبدالله بن عمرو ەوە رضي الله عنه : پێغەمبەر ﷺ پاڵی دابوو بە کەعبەوە، وە ئامۆژگاری خەڵکی کرد و بیری خستنەوە و فەرمووی : (ئافرەت سەفەر ناکات ئیللا لەگەڵ مەحرەمێکدا نەبێ بە ماوەی سێ شەو، وە ئافرەت مەهێنن بەسەر پوری لە باوکیەوە وە بەسەر پوری لە دایکیەوە) .

**٢٩٦** - لە عمرو بن شعیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە : پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا فەرمووی : (وە ئافرەت مارە ناکرێ بەسەر پوری لە باوکیەوە یان پوری لە دایکیەوە) .

**٢٩٧** - لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما : رسول الله ﷺ نەهی کردووە لەوەی ئافرەت مارە بکرێ بەسەر پوری لە باوکیەوە یان بەسەر پوری لە دایکیەوە .

**٢٩٨** - عائشة رضي الله عنها فەرمووی : لە دەسکی شمشێرەکەی رسول الله ـدا ﷺ دوو نامە دۆزرانەوە، لە دانەیەکیاندا هاتبوو : کە ئافرەت مارە ناکرێ بەسەر پوری لە باوکیەوە وە بەسەر پوری لە دایکیەوە .

**٢٩٩** - لە علي بن ابي طالب ـەوە رضي الله عنه رسول الله ﷺ نەهی کردووە لەوەی نێوان ئافرەت و پوری لە باوکیەوە کۆبکرێنەوە لەگەڵ ئافرەت و پوری لە دایکیەوە .

**٣٠٠** - لە سالم ـەوە لە باوکیەوە : رسول الله ﷺ نەهی کرد لە دوو نیکاح : ئافرەت بەسەر پوری لە باوکیەوە وە ئافرەت بەسەر پوری لە دایکیەوە .

---

: ئەمانە هەمووی مەبەستی ئەوەیە ئافرەتێك و پوری ئافرەتەکە نابێ لە هەمان کاتدا هاوسەری یەك پیاو بن، بۆ دوو خوشکیش بە هەمان شێوە .

**٣٠١** - **ابو عبدالله** وتی : وە لە ئایەتەکە تەنها دوو ئافرەتی شیری حەرام کردووە : کە دایك و خوشکی شیری دەکا، - لە ئایەتەکەدا - جگە لەو دوانەی حەرام

نەکردووە، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ﴾ [النساء : ٢٤]، جا ئەگەر بە پێی ڕووکەش و گشتی قورئان بوایە ئەوا دەبوو : ئەوانەی کە باس نەکراون لە ئایەتەکە حەڵاڵ بوونایە بۆ مارەکردن، لەبەر فەرمایشتی : ﴿وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ﴾، بەڵام هەواڵی جێگیر لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە بەوەی کە کچی برای شیری و کچی خوشکی شیری حەرام کردووە، وە ڕایگەیاندووە کە شیر ئەوە حەرام دەکات کە لە منداڵ بوونەوە حەرام دەبێ .

---

: مەبەستی ئەوەیە کە الله لە ئایەتی (النساء : ٢٣) چەند ئافرەتێکی حەرام کردووە کە مارە بکرێن، یەکێك لەوان دایك و خوشکی شیرین، وە لە ئایەتی دواتر فەرموویەتی جگە لەوانەی باسکران حەڵاڵن بۆ نیکاح، مارەکردن، جا ئەگەر بە پێی ڕووکەشی قورئان بوایە ئەوا کچی برای شیری و کچی خوشکی شیری دەبوو حەڵاڵ بن بۆ مارەکردن، بەڵام کە دەگەڕێینەوە بۆ سوننەت بۆمان دەردەکەوێ کە پێغەمبەر ﷺ منداڵی برا و خوشکی شیریشی حەرام کردووە، بە کورتی واتە ئەگەر برایەك یان خوشکێکی شیریت هەبێ ئەوا منداڵەکانیشی بۆت حەرامن و ناتوانی نیکاحیان لەگەڵ بکەی .

**٣٠٢** - لە عمرة وە لە عائشة وە رضي الله عنها پێی ڕاگەیاندووە : کە رسول الله ﷺ لای ئەو بووە، وە گوێی لە دەنگی پیاوێك بووە کە داوای ئیزن دەکات لە

ماڵی حفصة، عائشة فەرمووی : وتم : يا رسول الله ﷺ، ئەو پیاوە داوای ئیزن لە ماڵەکەی تۆدا دەکات .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (پێم وابێت فلاّن کەسە واتە مامی [شیری] حفصة) .

عائشة فەرمووی : يا رسول الله ﷺ! ئەگەر فلاّن کەس زیندوو بوایە واتە مامی شیریم جائیز بوو بێتە ژوورەوە بۆ لام؟

فەرمووی : (بەڵێ، شیر ئەوە حەرام دەکات کە منداڵ بوون حەرامی دەکات)

.

**٣٠٣** - علي بن ابي طالب رضي الله عنه فەرمووی : وتم : يا رسول الله ﷺ، بۆچی مەیلت بەلای قورەیشدا دەچێ و لەوان هەڵدەبژێری و واز لە ئێمە دێنی؟

فەرمووی : (ئایا شتێکت هەیە؟) .

وتی : کچەکەی حمزة .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئەو کچی برای شیریمە) .

**٣٠٤** - علي فەرمووی: کاتێك لە مەککە دەرچووین کچەکەی حمزة شوێنم کەوت و بانگی دەکردم: مامە مامە، منیش دەستیم گرت و بردم بۆ لای فاطمة، وتم: بگرە کچی مامت.

جا کە گەشتینە مەدینە وتم: یا رسول الله ﷺ، ئایا هاوسەرگیری لەگەڵ ناکەی؟

فەرمووی: (ئەو کچی برای شیریمە).

**٣٠٥** - علي بن ابي طالب فەرمووی: وتم: یا رسول الله ﷺ، ئایا جوانترین کچی قورەیشت پێ نیشان بدەم؟

فەرمووی: (کێیە؟).

وتم: کچی حمزة یە.

فەرمووی: (ئەی نەتزانیوە کە ئەو کچی برای شیریمە؟ وە الله ئەوەی لە شیر حەرام کردووە کە لە رەچەڵەك حەرامی کردووە).

**٣٠٦** - لە ابن شهاب ەوە: عروة بۆی باسکردووە لە زینب بنت أم سلمة وە: أم حبيبة ی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یا رسول الله ﷺ! کچەکەی ابو سفیان مارە بکە - واتە خوشکی ام حبیبة -.

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەوەت پێ خۆشە؟) .

فەرمووی : بەڵێ، خۆ تاکە ماوسەرت نیم، وە خۆشەویسترین کەس لە لام کە بمەوێ لە خێردا بەشدار بێ لەگەڵم خوشکەکەمە، رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەوە بۆ من حەڵاڵ نییە) .

أم حبيبة فەرمووی : يا رسول الله ﷺ! والله بۆمان باس کرا کە تۆ درة بن ابي سلمة مارە دەکەی!

فەرمووی : (کچەکەی ام سلمة؟) .

فەرمووی : بەڵێ .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر ئەو تەربێتدراوی - بەخێوکراو -ماڵەکەی ئێمە نەبوایە بۆم حەڵاڵ نەبوو، ئەو کچی برای شیریمە، ثويبة شیری بە من و ابو سلمة داوە - واتە لەبەر ئەم دوو هۆکارە بۆی حەڵاڵ نییە - ، جا کچەکانتان و خوشکەکانتان بۆ من پێشنیار مەکەن) .

ابن وهب وتی : ابن لهيعة وەکو ئەمەی پێ وتم لە الأعرج لە ابي سلمة بن عبدالرحمن ەوە .

**٣٠٧** - له زينب بنت ابي سلمة وه : أم حبيبة ی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ به رسول الله ی ﷺ وت : خوشكەكەم ماره بكه [واته] كچى ابو سفيان، رسول الله ﷺ پێی فەرموو : (ئەوەت پێ خۆشه؟) .

فەرمووی : من تاكه هاوسەرت نيم، وه خۆشەويسترين كەس لام كه بەشدار بێ لەگەڵم له خێردا خوشكەكەمه .

فەرمووی : (ئەوه حەڵاڵ نييه) .

فەرمووی : والله ئێمه باس لەوه دەكەين كه تۆ دەتەوێ درة بن ابي سلمة ماره بكەی .

فەرمووی : (كچى ام سلمة) .

فەرمووی : وتم : بەڵێ .

فەرمووی : (ئەگەر ئەو تەربێتدراوی - بەخێوكراو - ماڵەكەی ئێمه نەبوايه بۆم حەڵاڵ نەبوو، ئەو كچى برای شيريمه، ثويبة شيری به من و ابو سلمة داوه، جا كچەكانتان و خوشكەكانتان بۆ من پێشنيار مەكەن) .

عروة وتی : ثويبة بەندەی ابي لهب بوو، ئازادی كرد و شيری دا به رسول الله ﷺ، جا كه مرد ابو لهب هەندێ له خزمەكانی له خەوندا بينی، لێی پرسی: چيت دۆزيەوه؟

وتی: له دوای ئێوه هیچ حەسانەوەیەکم نەبینی، جگە لەوەی لێرەمەوە شیرم داوە.

**٣٠٨ - ابو عبدالله** وتی : ابو عبید لە پاشکۆی ئەم فەرموودەیە و غەیری ئەم فەرموودەیە وتی : ثویبة شیری بە حمزة ش داوە، جا رسول الله ﷺ و حمزة و ابو سلمة برای شیری یەکتر بوون .

**٣٠٩ -** برازاکەی ابن شهاب بۆی باسکردین لە مامیەوە وتی : عروة پێی ڕاگەیاندم کە زینب بنت ابي سلمة پێی ڕاگەیاندووە کە أم حبیبة ی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاند کە بە رسول الله ی ﷺ وت : یا رسول الله ﷺ، خوشکەکەم مارە بکە - واتە - کچەکەی ابو سفیان، پێم وابێ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (ئەوەت پێ خۆشە؟) .

وتی : بەڵێ، من تاکە هاوسەرت نیم، وە خۆشەویستترین کەس لە لام کە بەشدارم بێ لە خێردا خوشکەکەمە .

وتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەوە حەڵاڵ نییە) .

وتی : یا رسول الله ﷺ ، ئێمە باس لەوە دەکەین کە تۆ دەتەوێ درة بنت ابي سلمة مارە بکەی .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (کچەکەی أم سلمة؟) .

وتی : بەڵێ .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (سوێند بە الله ئەگەر ئەو تەربێتدراوی - بەخێوکراو - ماڵەکەی ئێمە نەبوایە بۆم حەڵاڵ نەبوو، ئەو کچی برای شیریمە، ثویبة شیری بە من و ابو سلمة داوە، جا کچەکانتان و خوشکەکانتان بۆ من پێشنیار مەکەن) .

**٣١٠** - لە يزيد بن ابي حبيب ەوە : کە محمد بن مسلم نامەی نوسی و باسی : ئەوەی دەکرد عروة بۆی باسکردووە : کە أم حبيبة ی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بۆی باسکردووە : کە بە رسول الله ی ﷺ وتووە : خوشکەکەم مارە بکە، هەمان فەرموودەی معمر و يعقوبی گێڕایەوە .

**٣١١** - زينب بنت ابي سلمة وتی : أم حبيبة ی کچی ابو سفيان رضي الله عنهما هات بۆ لای رسول الله ﷺ وتی : ئایا خوشکەکەمت دەوێ؟

فەرمووی : (جا چی لێبکەم؟) .

وتی : مارەی بکەیت .

فەرمووی : (تۆ ئەوەت پێ خۆشە) .

وتی : بەڵێ، من تاکە هاوسەرت نیم، وە خۆشەویسترین کەس کە بەشدارم بێ لە خێردا خوشکەکەمە .

فەرمووی : (ئەو بۆ من حەڵاڵ نییە) .

وتی : من پێم ڕاگەیێندراوە کە تۆ داوای درة بنت ابي سلمة ی کچی أم سلمة دەکەی .

فەرمووی : (ئەگەر ئەو تەربێتدراوی - بەخێوکراو - ماڵەکەی ئێمە نەبوایە بۆم حەڵاڵ نەبوو، ثویبة ی مەولای بەنی هاشم شیری بە من و باوکی داوە، بۆیە کچەکانتان و خوشکەکانتان بۆ من پێشنیار مەکەن) .

**٣١٢** - لە عراك بن مالك ـەوە : کە زینب بۆی باسکردووە : کە أم حبيبة رضي الله عنها بە رسول الله ی ﷺ وت : ئێمە باسی ئەوەمان دەکرد کە تۆ درة بنت ابي سلمة مارە دەکەی .

فەرمووی : (ئەگەر أم سلمة م مارە نەکردایە بۆم حەڵاڵ نەبوو، باوکی ئەو برای شیریمە) .

**٣١٣** - سليمان بن يسار لە أم حبيبة ـوە وەکو ئەمەی گێڕاوەتەوە .

**٣١٤** - لە البراء ـەوە رضي الله عنه :علي بە رسول الله ی ﷺ وت : ئایا داوای کچەکەی حمزة ناکەی؟

فەرمووی : (حمزة برای شیریمە) .

**٣١٥** - حميد بن عبدالرحمن بن عوف دەیوت : گوێم لە أم سلمة ی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو : بە رسول الله ﷺ وترا : یا رسول الله ﷺ تۆ لە کوێی بەرامبەر کچەکەی حمزة؟

یان وترا : ئایا داوای کچەکەی حمزة ناکەی؟

فەرمووی : (حمزة برای شیریمە) .

**٣١٦** - لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما : پێغەمبەریان ﷺ دەویست بۆ کچەکەی حمزة، فەرمووی : (ئەو کچی برای شیریمە، وە ئەوەی لە ڕێی شیرەوە حەرام دەبێ هەر ئەوەیە کە لە ڕێی ڕەچەڵەکەوە حەرام دەبێ) .

**٣١٧** - لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما : پێغەمبەریان ﷺ دەویست بۆ کچەکەی حمزة، فەرمووی : (ئەو بۆ من حەڵاڵ نییە، ئەو کچی برای شیریمە، وە ئەوەی لە ڕێی شیرەوە حەرام دەبێ هەر ئەوەیە کە لە ڕێی ڕەچەڵەکەوە حەرام دەبێ) .

**٣١٨** - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئەوەی لە ڕێی شیرەوە حەرام دەبێ هەر ئەوەیە کە لە ڕێی ڕەچەڵەکەوە حەرام دەبێ) .

**٣١٩** - لە عروة وە لە عائشة وە : پێی ڕاگەیاندووە کە : أفلح ی برای ابو القعیس هات داوای ئیزنی لێ کرد، کە مامی شیرییەتی، دوای ئەوەی کە - ئایەتی -

حیجاب دابەزی، ڕەتم کردەوە ڕێی پێ بدەم، جا کە رسول الله ﷺ هات ئەوەی کردبووم پێیم وت، ئەو فەرمانی پێکردم کە ڕێی پێ بدەم .

**٣٢٠** - لە عروة وە لە عائشة وە رضي الله عنها : أفلح ی برای ابو القعیس هات، داوای ئیزنی هاتنە ژوورەوەی لێ کرد، وتی : من مامی ئەوم - واتە مامی عائشة - ، ئەویش ڕەتی کردەوە ڕێگەی پێ بدا، جا کە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای، ئەوەی بۆ باسکرد .

فەرمووی : (ئایا ڕێگە بە مامت نادەی؟) .

فەرمووی : یا رسول الله ﷺ، ئافرەتەکە شیری پێداوم خۆ پیاوەکە شیری پێ نەداوم .

فەرمووی : (ڕێگەی پێبدە، چونکە ئەو مامتە، تَرِبَتْ يَمينُكِ) .

ابو القعیس هاوسەری ئەو ئافرەتە بوو کە شیری دابوو بە عائشة . وتی : وە هشام بن عروة وەکو ئەمەی بۆ باسکردم لە باوکیەوە لە عائشة وە .

---

: تَرِبَتْ يَمينُكِ دەستەواژەیەکە زانایانی زمانی عەرەبی قسەی جیاوازیان لە بارەوە کردووە، یەکێك لەوانە ئەوەیە : هەژار بوویت لە زانستدا، واتە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو کە عائشة نەیزانیوە و نەیپێکاوە، والله اعلم .

**٣٢١** - برازاكەی ابن شهاب لە مامیەوە وتی : عروة پێی ڕاگەیاندم لە عائشة وە كە پێی ڕاگەیاندووە أفلح ی برای ابو القعيس هاتووە بۆ لای، وە ابو القعيس عائشة ی هاوسەری پێغەمبەری ﷺ بەخێو كردووە، جا أفلح هات بۆ لای و وتی كە براكەی داوای ئیزنی هاتنە ژوورەوە دەكا، ئەویش ڕەتی كردەوە ڕێگەی پێبدا تاكو ئەوەی بۆ رسول الله ﷺ باسكرد، فەرمووی : یا رسول الله ﷺ، أفلح ی برای ابو القعيس هات داوای ئیزنی هاتنە ژوورەوەی لێدەكردم، منیش ڕێگەم پێی نەدا .

رسول الله ﷺ پێی فەرموو : (جا چی ڕێگری لێكردی لەوەی ڕێگا بە مامت بدەی؟) .

فەرمووی : یا رسول الله ﷺ، ابو القعيس شیری بە من نەداوە، بەڵكو ژنەكەی شیری پێداوم .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (كە هات بۆ لات ڕێگەی پێبدە، چونكە ئەو مامتە) .

**٣٢٢** - عروة بن الزبير وتی : براكەی ابو القعيس داوای ئیزنی هاتنە ژوورەوەی لە عائشة كرد، كە مامی شیریەتی، جا ڕێی پێنەدرا، تا رسول الله ﷺ هاتەوە و ئەوەی بۆ باس كرد، رسول الله ﷺ فەرمووی : (تَرِبَتْ يَمينُكِ، ئەو

مامته، ڕێی پێبده، چونكه شیر ئەوە مەحرەم دەكا كە لە دایكبوون مەحرەمی دەكا) .

**٣٢٣** - بكیر وتی : گوێم لە سلیمان بن یسار بوو دەیگێڕایەوە كە پیاوێك چوو بۆ لای عائشة، كە برای شیری عائشة بوو، جا عائشة هەستا بۆ ئەوەی خۆی لێبشارێتەوە، بۆیە رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەو براتە، وە شیر ئەوە مەحرەم دەكا كە لە دایكبوون مەحرەمی دەكا) .

**٣٢٤** - بكیر وتی : عبدالرحمن بن قاسم یش ئەوەی وت .

**٣٢٥** - مكحول لە عروة لە عائشة لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەمان شتی گێڕاوەتەوە .

ابن ابي الزناد لە باوكیەوە لە عروة لە عائشة هەمان شتی گێڕاوەتەوە .

هەروەها ابن شهاب لە عروة لە عائشة لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەمان شتی گێڕاوەتەوە .

**٣٢٦** - لە عروة بن الزبير ـەوە : عائشة رضي الله عنها پێی ڕاگەیاندووە : كە مامی شیری ناوی أفلح بوو، داوای ئیزنی هاتنە ژوورەوەی لێ كرد، ئەویش خۆی لێ داپۆشی، جا بە رسول الله ی ﷺ ڕاگەیاند، ئەویش پێی فەرموو : (خۆتی لێ

دامەپۆشە، چونکە ئەوەی شیر مەحرەمی دەکا هەر ئەوەیە کە ڕەچەڵەك مەحرەمی دەکا).

**٣٢٧** - لە عطاء ەوە، عروة بن الزبیر پێی ڕاگەیاندم کە عائشة پێی ڕاگەیاندووە و فەرموویەتی: أبو الجعد ی مامی شیریم داوای ئیزنی هاتنە ژوورەوەی لێکردم، منیش ڕەتم کردەوە.

هشام وتی: ئەو برای ابو القعیس ە، جا کە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە پێی ڕاگەیاند، بۆیە فەرمووی: (ئایا ئیزنی پێ نادەی، تَرِبَتْ يَمينُكِ أو يدك).

**٣٢٨** - ابن جريج وتی: بە عطاء م وت: شیری الفحل مەحرەمی دەکا؟

وتی: بەڵێ.

وتم: ئایا لە کەسێکی جێگیرەوە ئەمەت پێگەیشتووە؟

وتی: بەڵێ، الله فەرموویەتی: ﴿وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ﴾ **[النساء: ٢٣]**، جا ئەو خوشکتە لە باوکتەوە.

: شیری الفحل ئەو شیرەیە کە لە ژنەوە دێتە دەرەوە بە هۆی ئەوەی منداڵی لە مێردەکەی یان گەورەکەی بووە.

٣٢٩ - **ابو عبدالله** وتی : وه الله له ئایەتەکەدا دایك و خوشکی شیری حەرام کردووه، شیر پێدانێکی تایبەت نەکردووه بە بێ شیر پێدانێکی تر، جا ئەگەر بە پێی ڕووکەش و گشتی قورئان بوایە ئەوا دەبوو : بە کەمێك شیر مەحرەم بوایە هەروەکو چۆن بە زۆرێکی مەحرەم دەبێ، وه ماوەڵان و ئەوانەی دوای خۆیان بۆ ئەمە چوون لەوانەی کە بە کەمێك شیر و زۆرێکی حەرامیان کردووه .

٣٣٠ - ابي الزبير وتی : عطاء ناردمی بۆ لای عبدالله بن عمر رضي الله عنهما پرسیارمان لێکرد سەبارەت بەو ئافرەتەی یەك شیر دەدا بە منداڵ - منداڵی کوڕ - لە بێشکەدا - لانك - .

فەرمووی : ئافرەتەکە لەسەری حەرامە .

وتمان : عائشة و ابن الزبير پێیان وایە بە دوو شیر پێدان لەسەری حەرام نابێ .

فەرمووی : کتێبی الله ڕاستترە لە قسەی ئەوان، پاشان ئایەتی شیر پێدانی خوێندەوە .

٣٣١ - عمرو بن دينار وتی : پرسیار لە عبدالله بن عمر کرا دەربارەی شتێك لە شیر پێدان، نازانم تەنها ئەوەندە نەبێ کە الله خوشکی شیری حەرام کردووه،

پیاوێکیش وتی : بەڵام ابن الزبیر دەڵێ : بە یەك شیر پێدان و دوو شیر پێدان حەرام نابێ .

ابن عمر فەرمووی : بڕیاری الله باشترە لە بڕیاری تۆ و بڕیاری ابن الزبیر .

**٣٣٢** - **ابو عبدالله** وتی : جا ئەگەر هەواڵی رسول الله ﷺ نەبوایە کەوا فەرموویەتی : (مژێك و دوو مژ حەرامی ناکەن) ئەوا کارکردن بە ڕووکەش و گشتی قورئان واجب دەبوو بەو شێوەیەی کە ابن عمر و جگە لەو بۆی چوونە، بەڵام کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ جێگیر بوو کە فەرموویەتی : (مژێك و دوو مژ حەرامی ناکەن) دەلالەتی لەوە کرد کە الله مەبەستی : هەندێك شیرپێدان بووە و مەبەستی هەندێکی تری نەبووە .

**٣٣٣** - لە ام الفضل ەوە : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (مژێك و دوو مژ حەرامی ناکەن) .

**٣٣٤** - لە عائشة وە : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (مژێك و دوو مژ حەرامی ناکەن) .

**٣٣٥** - لە الزهري ەوە، عروة بن الزبیر بۆی باسکردم، کە عبدالله بن الزبیر بۆی باسکردووە : کە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (مژێك و دوو مژ لە شیر حەرامی ناکەن) .

**٣٣٦** - عروة بن الزبير، لە براکەیەوە عبدالله بن الزبیر کە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (مژێك و دوو مژ لە شیر حەرامی ناکەن) .

**٣٣٧** - لە عائشة وە : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (مژێك و دوو مژ حەرامی ناکەن) .

**٣٣٨** - لە ام عائشة وە : رسول الله ﷺ فەرمووی : (مژێك و دوو مژ لە شیر حەرامی ناکەن) .

**٣٣٩** - عبدالله بن الزبير رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (مژێك و دوو مژ لە شیر حەرامی ناکەن) .

**٣٤٠** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (مژێك و دوو مژ حەرامی ناکەن، ئیللا بەوە نەبێ کە ڕیخۆڵەکان پڕ دەکا) .

**٣٤١** - **ابو عبدالله** وتی : وە هاوشێوەی ئەمە فەرمایشتی الله عز و جل ە : ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا﴾ [**المائدة** : ٣٨]، جا ئەگەر سوننەتی رسول الله ﷺ نەبوایە کە ڕوونکەرەوەی مەبەستی الله یە, ئەوا بڕین واجب دەبوو لەسەر هەموو ئەو کەسانەی ناوی دزیان دەچێتە سەر، ئەگەر چی دزیەکەی کەم بێ یان زۆر, چونکە الله بە گشتی باسی دزی نێر و دزی مێ کردووە، دزێکی لە دزێکی تر جیا نەکردۆتەوە .

وە ئەهلى عيلم ڕێك كەوتوون لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ لە سوننەتەكەیدا دایناوە كە دەستی دز نابڕدرێ هەتاكو نەگاتە نرخێك، ئینجا جیاوازیان تێكەوت دەربارەی بڕی ئەو نرخە .

وە هەواڵی جێگیر لە پێغەمبەرەوە ﷺ لای ئەهلی مەعریفەت ئەوە بووە كە بڕینی لابردووە لەسەر ئەو كەسەی كەمتر لە ڕوبعە دینارێكی دزیوە، وەكو فەرموویەتی : (بڕین لە ڕوبعە دینارێك بەرەو سەرەوەوەیە) .

**٣٤٢** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (بڕین لە ڕوبعە دینارێك بەرەو سەرەوەوەیە) .

**٣٤٣** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (دەستی دز لە ڕوبعە دینارێك بەرەو سەرەوە دەبڕدرێ) .

**٣٤٤** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (دەستی دز لە ڕوبعە دینارێك بەرەو سەرەوە دەبڕدرێ) .

**٣٤٥** - لە عمرة وە : گوێی لە عائشة بووە كە باسی كردووە : كە گوێی لە رسول الله ﷺ بووە فەرموویەتی : (دەست نابڕدرێ ئیللا لە ڕوبعە دینارێك بەرەو سەرەوە نەبێ) .

**٣٤٦** - رسول الله ﷺ دەیفەرموو : (دەست نابڕدرێ ئیللا لە ڕوبعە دینارێك و سەروویەوە نەبێ) .

**٣٤٧** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (دەست نابڕدرێ ئیللا لە ڕوبعە دینارێك نەبێ) .

**٣٤٨** - رسول الله ﷺ دەیفەرموو : (بڕین بوونی نییە ئیللا لە ڕوبعە دینارێك بەرەو سەرەو نەبێ) .

**٣٤٩** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (بڕین لە ڕوبعە دینارێك بەرەو سەرەووەیە) .

**٣٥٠** - **ابو عبدالله** وتی : جا ئەوانەی پێیان وابوو کە دەکرێ قورئان بە سوننەت نەسخ ببێتەوە وتیان : بڕین لە کاتی دابەزینی فەرمایشتی : ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا﴾ [المائدة : ٣٨] بوو، وە دوای ئەمە واجب بوو لەسەر هەموو دزێك، ئەگەر چی دزیەکەی کەم بووبێت یان زۆر، هەتاوەکو ئەو کاتە کە پێغەمبەر ﷺ بڕینی لەسەر ئەو کەسە لابرد کە دزیەکەی کەمترە لە ڕوبعە دینارێك، بەم شێوەیەش ئەو ئایەتەی کە فەرمانی بە بڕینی دەستی دز تێدایە نەسخ بۆوە بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ - واتە ئەم کۆمەڵەیە دەڵێن کە الله بە گشتی فەرمانی بە بڕینی دەستی دز کردووە ئەگەر چی دزیەکەشی کەم بووبێ یان زۆر، بەڵام دواتر کە

وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ ناردووە بەوەی کە لە ڕوبعە دینارێك بەرەو سەرەوە دز دەستی دەبڕدرێ، ئەم کۆمەڵەیە پێیان وایە کە ئەو فەرموودەیە ئایەتەکەی [**المائدة : ٣٨**] ی نەسخ کردۆتەوە - وە لە مەزهەبی الشافعي و ماوەڵانیدا ئەوەی - لە ئایەتەکەدا - هەیە جێگیرە، و سوننەت هیچی لە قورئان نەسخ نەکردۆتەوە، بەڵکو دەلالەتی لەوە کردووە ئەگەر چی ئایەتەکە تیلاوە بکرێ دەرخستەکەی گشتیە، بەڵام تایبەتە لە واتادا، واتاکەشی هەندێك دز دەگرێتەوە و هەندێکی تریان ناگرێتەوە - واتە الشافعي پێی وایە کە فەرموودەکە ئایەتەکەی نەسخ نەکردۆتەوە، بەڵکو تەنها ڕوونی کردۆتەوە - .

وە هاوشێوەی ئەوەی کە باسمان کرد بریتیە لەوەی : کە الله عز و جل لە سوڕەتی البقرة نیکاح کردنی حەرام کردووە لەگەڵ موشریکەکاندا هەتاکو ئیمان دەهێنن : ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ [**البقرة : ٢٢١**]، جا ئەمە لە ڕوکەشدا گشتیە و دەکەوێتە سەر هەموو موشریکەکان، لەگەڵ ئەوەشدا لە سوڕەتی المائدة نیکاح کردنی لەگەڵ ئەهلی کیتابدا - جولەکە و گاور - حەڵاڵ کردووە لە کاتێکدا موشریکیشن، ئەهلی عیلمیش جیاوازیان تێکەوت سەبارەت بە لێکدانەوەی ئەمە، کۆمەڵێك وتیان : نیکاح کردن لەگەڵ هەموو موشریکەکاندا، بە ئەهلی کیتاب و غەیری ئەهلی کیتابەوە، حەرام بوو لەو ئایەتەی سوڕەتی البقرة، پاشان الله حەرام کردنی ئافرەتانی ئەهلی کیتابی نەسخ کردەوە، و لە سوڕەتی المائدة دا حەڵاڵی کرد، وە وازی لە باقی موشریکەکان هێنا لەسەر ئەو حاڵەتەی خۆیان - واتە غەیری ئەهلی کیتاب هەر حەرامن و حەڵاڵی نەکردوون - جا بەم شێوەیە بەشێك لە ئایەتەکە - واتە ئەوەی سوڕەتی البقرة - لەم وتەیەدا

نەسخ بۆتەوە، و باقیەکەی جێگیرە، ئەم وتەیەش لە کۆمەڵێك لە سەلەفەوە گێڕدراوەتەوە .

**٣٥١** - لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما : لە بارەی فەرمایشتی : ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ [**البقرة** : ٢٢١] فەرمووی : لەمەدا ئافرەتانی ئەهلی کیتابی نەسخ کردەوە، بۆ موسڵمانانی حەڵاڵ کردن، وە موسڵمانانی لەسەر پیاوەکانی ئەوان حەرام کرد .

---

: واتە پیاوی موسڵمان بۆی هەیە ئافرەتی ئەهلی کیتاب مارە بکا، بەڵام ئافرەتی موسڵمان نابێ شوو بە پیاوی ئەهلی کیتاب بکات .

**٣٥٢** - ابن عباس فەرمووی : کاتێك ئەم ئایەتە : ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ [**البقرة** : ٢٢١] دابەزی، خەڵکی خۆیان لەو ئافرەتانە دەپاراست، تاکو ئایەتی : ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ﴾ [**المائدة** : ٥]، فەرمووی : پاشان خەڵکی ئافرەتانی ئەهلی کیتابیان مارە کرد .

**٣٥٣** - لە الربيع بن أنس ـەوە دەربارەی فەرمایشتی : ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ [**البقرة** : ٢٢١]، وتی : ئایەتی دوای ئەم لە المائدة دا دابەزی :

﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ﴾ [المائدة : ٥]، جا ئافرەتانی ئەهلی کیتابی لە موشریکەکان جیاکردەوە .

**٣٥٤** - مکحول وتی : ئافرەتانی مەجوس لە غەیری سەفەر و لە غەزاش مارە مەکەن نە ئازادیان نە کۆیلەیان هەتاکو موسڵمان دەبن، چونکە الله ئافرەتە موشریکەکانی لەسەر ئیمانداران حەرام کردووە لە سورەتی البقرة دا، پاشان ڕەحمی پێکردن لە سورەتی المائدة دا و ئافرەتە جولەکە و گاورەکانی بۆ حەڵاڵ کردن، وە لە باقی ئافرەتان گەڕا .

**٣٥٥** - **ابو عبدالله** وتی : وە غەیری ئەمانە لە ئەهلی عیلم وتیان : لە دوو ئایەتەکەدا - واتە ئەوەی البقرة و ئەوەی المائدة - ناسخ و مەنسوخ بوونی نییە، بەڵکو الله لە ئایەتەکەی البقرة مەبەستی : موشریکەکانی غەیری ئەهلی کیتاب بووە .

: واتە کۆمەڵەیەکی تر پێیان وا نیە کە ئایەتەکەی المائدة ئایەتەکەی البقرة ی نەسخ کردبێتەوە، بەڵکو پێیان وایە کە الله لە ئایەتەکەی البقرة تەنها مەبەستی غەیرە ئەهلی کتاب بووە .

**٣٥٦** - سعید بن جبیر دەربارەی فەرمایشتی : ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ [البقرة : ٢٢١]، وتی : ئەهلی بتەکانن .

**٣٥٧** - قتادة دەربارەی فەرمایشتی : ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ [البقرة : ٢٢١]، وتی : واتە موشریکەکانی عەرەب ئەوانەی کە بەندەی بتەکانن .

**٣٥٨** - قتادة دەربارەی فەرمایشتی : ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ [البقرة : ٢٢١]، وتی : ئەو موشریکانەی کە لە ئەهلی کیتاب نین .

**٣٥٩** - **ابو عبدالله** وتی : وە مەزهەبی الشافعي دەربارەی ئەم دوو ئایەتە بەو شێوەیەیە کە پێم ڕاگەیاندیت کە لە هیچ یەك لەو دوو ئایەتە ناسخ و مەنسوخ بوونی نییە، تەنها ئەوە نەبێ کە ئایەتەکەی کە لە سورەتی البقرة هەیە لەو گشتیانەیە کە مەبەستی تایبەتی پێی هەبووە، وە لەو موجمەلانەیە کە موفەسیر - واتە پێغەمبەر ﷺ - دەلالەتی لێ کردوون، وە بە هەمان شێوە هەموو دوو ئایەتێك کە لە کتێبی الله هاتووە دەرخستەی یەکێکیان گشتیە هەندێك شت حەرام دەکات و هەندێك شتیش حەڵاڵ دەکا، گشتیە لە ڕووکەشدا، وە ئەوەی تریان هەندێك لە گشتیەکە دیاری دەکا بە حەرام کردن، پاشان حەڵاڵی دەکا، یان هەندێك گشتی دیاری دەکا بە حەڵاڵ، پاشان حەرامی دەکا، وە بە هەمان شێوە ئەگەر یەکێك لە ئایەتەکان فەرزێك بە عام واجب بکا، ئەوا ئایەتەکەی تر هەندێك فەرز دیاری دەکا و لایدەبا، جا دەربارەی ئەو خیلافەی کە لەم ڕووە لەو دوو ئایەتە هەیە، باسی هەموویمان لابرد, لەبەر کەڕاهیەتی درێژبوونەوە . وە زۆرێك لەوەمان هێناوە لە کتێبەکانی ترماندا، وە بە هەمان شێوە هەر ئایەتێك هاتبێ ئەوا فەرزبوونی شتێك بە گشتی باس دەکا یان حەڵاڵی

دەكا یان حەڕامی دەكا، وە سوننەت هاتووە بە لابردنی هەندێك فەرزی گشتی لە ئایەتەكەدا، یان هاتووە بە حەڵاڵ كردنی هەندێ حەرامكراوی گشتی ئایەتەكە، یان بە حەرام كردنی هەندێك حەڵاڵكراوی گشتی ئایەتەكە، جا لەو ڕووەی كە باسمان كرد جیاوازی زۆر بوونی هەیە .

**٣٦٠** - وە لەوانە ئەوەیە كە الله عز و جل فەرموویەتی : ﴿**الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ**﴾ [**النور : ٢**], جا ناوی زیناكار كەوتۆتە سەر كچ و ژن، لە پێش دابەزینی ئەم ئایەتەوە حەدێكی دیاریكراو نەبوو بۆ هەردوو زیناكارەكە، سزاكەیان بریتی بوو لە زیندانی كردن و ئازاردان .

**٣٦١** - ابن عباس رضي الله عنه دەربارەی فەرمایشتی : ﴿**وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ**﴾ [**النساء : ١٥**]، فەرمووی : ئافرەت كاتێك تاوانی بكردایە [زینا] ئەوا زیندانی دەكرا، هەتاكو ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿**الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ**﴾ [**النور : ٢**]، جا دەرووی بۆ كردنەوە بە حەدەكان .

**٣٦٢** - لە مجاهد ەوە : ﴿**وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ**﴾ [**النساء : ١٥**]، وتی : زینایە، وتی : كاتێك چوار كەس شاهێدی لەسەر دەدان فەرمان بە زیندانی كردنیان دەدرا، تاكو دەمردن یان الله دەروویەكی بۆیان دەكردەوە، وە دەرووەكە : حەد بوو .

وە دەربارەی فەرمایشتی الله : ﴿وَاللَّذَانِ يَأْتِيَانِهَا مِنْكُمْ﴾ [النساء : ١٦]، دوو پیاوە زیناکارەکە ﴿فَآذُوهُمَا﴾ وتی : جنێویان پێبدەن . هەموو ئەمانە ئەو ئایەتەی سوڕەتی النور نەسخی کردنەوە بە حەدێکی فەرزکراو .

**٣٦٣** - لە قتادة وە : ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ فِى ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾ [النساء : ١٥]، وتی : ئەمە لە پێش حەدەکانەوە بوو، هەردووکیان ئازار دەدران، جا ئافرەتەکە زیندانی دەکرا، پاشان الله لە دوای ئەوەوە دەروویەکی بۆیان کردەوە، دەرووی ئەوانەی کە حصن کرابوون - واتە ئەوانەی هاوسەریان هەبوو - کرد بە : سەد جەڵد، پاشان بەرد باران کردن، وە ئەوانەی حصن نەکرابوون - سەڵت بوون - : سەد جەڵد پاشان دوور خستنەوە بۆ ماوەی ساڵێك .

**٣٦٤** - لە عبادة بن صامت رضي الله عنه كە ئەو ڕۆژە پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ دابەزی، جا هاوەڵانی سەریان دانەواند، وە کاتێك کە وەحی لەسەر لاچوو، هاوەڵانی سەریان بەرز کردەوە، رسول الله ﷺ فەرمووی : (لە منەوە وەری بگرن، ژن بە ژن : سەد جەڵد پاشان بەردباران کردن، وە کچ بە کچ : سەد جەڵد و دوور خستنەوە بۆ ماوەی ساڵێك) .

**٣٦٥** - لە قتادة وە : ﴿وَٱلَّتِى يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِى ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾ [النساء : ١٥]، وتی : ئەمە لە پێش حەدەکانەوە بوو . ﴿وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَٰنِهَا

مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ﴾ [النساء : ١٦]، وتى : ئەمە يەكەم كار بوو دەربارەى ئەوان، ئافرەتەكە زيندانى دەكرا، وە هەردووكيان بە قسە و جنێو ئازار دەدران، پاشان ئەمە نەسخ بۆوە لە سورەتى النور وە الله دەرووبەكى بۆ كردنەوە : ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾ [النور : ٢] .

**٣٦٦** - لە قتادة وە دەربارەى فەرمايشتى : ﴿وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَٰنِهَا مِنكُمْ﴾ [النساء : ١٦]، وتى : حەدەكان نەسخى كردەوە .

**٣٦٧** - لە قتادة وە دەربارەى فەرمايشتى : ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ فِى ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾ [النساء : ١٥]، وتى : حەدەكان نەسخى كردەوە .

**٣٦٨** - الضحاك بن المزاحم دەربارەى فەرمايشتى : ﴿أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾ [النساء : ١٥]، دەيوت : حەد ئەم ئايەتەى نەسخ كردەوە .

**٣٦٩** - لە عبادة بن الصامت ەوە رضي الله عنه فەرمووى : الله ئايەتى : ﴿وَٱلَّٰتِى يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِى ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾ [النساء : ١٥] دابەزاند، جا سزاى ئەمە زيندانى كردن بوو، رسول الله ﷺ فەرمووى : (وەريگرن، وەريگرن، الله دەرووبەكى بۆ كردنەوە، كچ بە كچ : سەد جەڵد و دوور خستنەوە بۆ ماوەى ساڵێك، وە ژن بە ژن : سەد جەڵد و بەردباران كردن) .

**٣٧٠** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (لێم وەرگرن، لێم وەرگرن، الله دەروویەکی بۆ کردنەوە، کچ بە کچ : سەد جەڵد و دوور خستنەوە بۆ ماوەی ساڵێك، وە ژن بە ژن : سەد جەڵد و بەردباران کردن) .

**٣٧١** - عبادة بن الصامت فەرمووی : وەحی بۆ رسول الله ﷺ دابەزی و فەرمووی : (وەریگرن، وەریگرن، الله دەروویەکی بۆ کردنەوە، ژن بە ژن : سەد جەڵد و بەردباران کردن، کچ بە کچ : سەد جەڵد و دوور خستنەوە بۆ ماوەی ساڵێك) .

**٣٧٢** - **ابو عبدالله** وتی : وە مصریەکان لە الشافعي ەوە گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی : پێش ئەوەی حەدەکان دابەزن سزا بۆ سەرپێچیەکان هەبوون، جا کە حەدەکان دابەزین نەسخی ئەو سزایانەیان کردووە کە - ئێستا - حەدی هەیە .

**٣٧٣** - لە النعمان بن مرة وە رضي الله عنه : رسول الله ﷺ فەرمووی : (چی دەڵێن دەربارەی ئارەقخۆر و زیناکار و دز - لە کاتێکدا ئەم پرسیارەی کرد کە حەدەکان دانەبەزیبوون - ؟ ).

وتیان : الله و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی : (ئەوانە فاحیشەن، وە لە بەرامبەردا سزا هەیە) .

**٣٧٤** - الشافعي وتی : وە هەمان واتا لە کتێبی الله دا، ئەوەیە کە الله فەرموویەتی : ﴿وَٱلَّٰتِي يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ﴾ [النساء : ١٥]، وە ئەوەی دوای خۆی .

**٣٧٥** - الشافعي وتی : جا ئەمە یەکەم سزا بوو بۆ زیناکاران لە دونیادا، پاشان ئەمە بۆ هەموو زیناکاران نەسخ بۆوە، بە ئازاد و کۆیلە، و کچ و ژنیانەوە، پاشان الله حەدی بۆ کچانی ئازادی موسڵمان دانا، فەرمووی : ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾ [النور : ٢]، وە باسی فەرموودەی ابي هريرة و زيد بن خالد ی کرد :

**٣٧٦** - لە ابي هريرة، و زيد بن خالد، و شبل بن معد رضي الله عنهم، دەفەرموون : لای رسول الله ﷺ بووین پیاوێك هەستا وتی : سوێندت دەدەم بە الله ئایا بە کتێبی الله حوکم لە نێوانمان دەدەی؟

وە دژەکەی هەستا کە لەو فەقیهتر بوو وتی : ڕاست دەکا، بە کتێبی الله حوکم لە نێوانمان بدە و ڕێگەم پێبدە .

فەرمووی : بڵێ .

وتی : کوڕەکەم کرێکار بوو لێرە، وە زینای لەگەڵ ئافرەتەکەدا کردبوو، وە سەد مەڕ و خزمەتکارێکم وەکو فیدیە دا، پاشان پرسیارم لە چەند پیاوێك کرد لە ئەهلی عیلم، پێیان وتم کە کوڕەکەت سەد جەڵد و دوورخستنەوەی لەسەرە

بۆ ماوەی ساڵێك، وە لەسەر ئەو ئافرەتەش بەردباران كردن هەیە، جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە بە كتێبی الله حوكم دەكەم لە نێوانتاندا : سەد مەڕەكە و خزمەتكارەكە بۆ تۆ گەڕێنرایەوە، لەسەر كوڕەكەت سەد جەڵد و دوورخستنەوە هەیە بۆ ماوەی ساڵێك، وە ئەی أنیس بڕۆ بۆ لای ئەو ژنە، ئەگەر دانی پێدا نا ئەوا بەردبارانی بكە) جا ڕۆیشت بۆ لای و دانی پێدا نا و بەردبارانی كرد .

**٣٧٧** - عبیدالله بن عبدالله بن عتبة لە ابي هريرة و خالد بن زيد ەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەمان شتی گێڕاوەتەوە . وە اسحاق وتی : واتای : لەو فەقیهتر بوو، مەبەستی ئەوەیە : ئەو كاتەی كە مشتومڕی لەگەڵ نەكرد .

**٣٧٨** - **ابو عبدالله** وتی : وە الشافعي فەرموودەی عبادة بن الصامت ی باس كرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموویەتی : (لێم وەرگرن، لێم وەرگرن) .

**٣٧٩** - الشافعي وتی : ئەمە یەكەم شت بوو لە زیندانی كردنی زیناكاران و ئازاد كردنیان كە نەسخ بۆوە، وە یەكەم دانە لە دوو حەدەكە لە بارەیانەوە دابەزی، پاشان جەڵد بۆ ژنەكان نەسخ بۆوە، وە حەدەكەیان بە بەردباران كردن دانرا، جا پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێكی بەردباران كرد و جەڵدی نەكرد، وە ماعز بن مالك ی بەردباران كرد و جەڵدی نەكرد، وە دوو یەهودیەكەی بەردباران كرد و جەڵدی نەكردن .

**٣٨٠** - له ابي هريرة و زيد بن خالد و شبل ـهوه كه فهرموويانه : پێغهمبهر ﷺ بهردبارانی كرد و جهڵدی نهكرد .

**٣٨١** - **ابو عبدالله** وتی : الشافعي وتی : چی دهلالهتی لهوه كرد كه ژنی پیاوهكه و ماعز بوون له دوای فهرمایشتی پێغهمبهر ﷺ : (ژن سهد جهڵد و بهردباران كردنی لهسهره)؟

وترا : كه رسول الله ﷺ فهرموویهتی : (لێم وهرگرن، چونكه الله دهروویهكی بۆیان كردهوه، ژن به ژن : سهد جهڵد و بهردباران كردن), جا لهمهدا بهڵگه ههیه لهسهر ئهوهی ئهمه یهكهم حهد بووه بۆ زیناكاران، وه ئهگهر سهرهتا بووبێ، ئهوا ههموو حهددێك گهیهنهری خۆی هاتووه - واته ههر كات حهدێك دابهزیێ كهسانێك ههر ههبوونه تووشی هاتبێتن، ئهگهر چی حهدهكه نهسخیش بووبێتهوه یاخود ههر مابێ و كاری پێ بكرێ - ، جا عیلمیش بهوهی دوای خۆی ههیه، وه ئهوهی له دواترهوه دێ نهسخی ئهوهی پێشوو دهكاتهوه ئهگهر پێچهوانهی یهكتر بوون .

**٣٨٢** - **ابو عبدالله** وتی : وه ئهمه وتهی عاممهی ئههلی فهتوایه له خهڵكی حیجاز و عێراق و شام و مصر، و غهیری ئهوانیش له ئههلی ئهثهر كه دهڵێن : زیناكاری كچ كه حصن نهكراوه : سهد جهڵد دهكرێ، و ساڵێك دوور دهخرێتهوه، وه بۆ زیناكاری ژن كه حصن كراوه : بهردباران دهكرێ، و جهڵدی لهسهر نییه .

جا هەر كەس فەرموودەى عبادة ى زانى و جێگیرى كرد، ئەوا پێى وایە جەڵد كردنى زیناكارانى كچ بە كتێبى الله یە، وە دووریان دەخاتەوە بە سوننەتى رسول الله ﷺ، وە لە دوورخستنەوەكەیدا بەڵگەى بە فەرموودەى عبادة و غەیرى ئەو هێناوەتەوە لەو هەوالانەى دەربارەى دوورخستنەوە هاتوون، وە جەڵدى لەسەر زیناكارانى ژن لابردووە، و بەردبارانى لەسەریان جێگیر كردووە بەو هەوالانەى كە الشافعي بەڵگەى پێیان هێناوەتەوە، وە بە سوننەت جەڵدى كردووە بە نەسخكراو لەسەر ژنەكان .

**٣٨٣ - ابو عبدالله** وتى : جا لەم بابەتەدا الشافعي نەسخ بوونەى قورئانى بە سوننەت جێگیر كردووە، چونكە جەڵدى بۆ سەر زیناكارانى كچ جێگیر كردووە لەگەڵ دوورخستنەوەیاندا لە كاتى دابەزینى ئایەتى جەڵدى زیناكاران : جەڵد بە قورئان و سوننەت، وە دوورخستنەوەیان : بە سوننەت، وە بە هەمان شێوە بەردبارانى بۆ سەر زیناكارانى ژن بە فەرموودەى عبادة جێگیر كردووە لە كاتى دابەزینى ئایەتەكە، جەڵد : بە قورئان و سوننەت، وە بەردباران بە سوننەت . وە پێى وایە كە ئەوە - واتە جەڵد و بەردباران بە یەكەوە - یەكەم حەد بووە بۆ زیناكارانى ژن، پاشان پێى وایە كە پێغەمبەر ﷺ جەڵدى لەسەر زیناكارانى ژن هەڵگرتووە، و بەردبارانى لەسەریان جێگیر كردووە، جا دانى بەوەدا ناوە كە ئەو جەڵدەى بە كتێبى الله واجب كرابوو لەسەر زیناكارانى ژن لە كاتى دابەزینى ئایەتەكەدا ئەوا پێغەمبەر ﷺ لەسەریان هەڵیگرتووە، بەم

شێوەیەش جەڵد لەسەر زیناکارانی ژن نەسخ بۆتەوە بە سوننەتی رسول الله ﷺ. الحمدلله ئەمە ڕوونە و کێشەی تێدا نییە .

بەڵام ئەوانەی کە فەرموودەی عبادة یان نەزانی دەربارەی ئایەتەکە یەکێك لەم دوو قسەیەیان کرد، هەروەکو چۆن دەربارەی فەرماشتی : ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا﴾ [المائدة: ٣٨]، لەگەڵ ئەوانەی کە پێیان وابوو دەکرێ قورئان بە سوننەت نەسخ ببێتەوە کە بەشێك لە ئایەتەکەیان بە نەسخ کراو دانا، و بەشەکەی تری بە موحکەم - واتە نەسخ نەکراو - .

وە ئەو کۆمەڵەیەی تر کە پێیان وابوو مەبەست لێی شتێکی گشتیە کە مەبەستێکی تایبەتی لە پشتەوەیە، وتیان : مەبەست لە فەرمایشتی : ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا﴾ [النور: ٢]، بریتیە لە : کچە غەیری محصنەکان، وە مەبەستی ژنە محصنەکان نیە .

ئەمەش مەزهەبی جمهوری ئەهلی عیلمە .

: واتە کۆمەڵەی یەکەم دەڵێن ئایەتی حەد بۆ سەر زیناکاران بەشێکی نەسخ بۆتەوە بە سوننەت و بەشەکەی تری نەسخ نەبۆتەوە و موحکەمە، بەڵام کۆمەڵەی دووەم دەڵێن کە شتێکی گشتیە و سوننەت ڕوونی کردۆتەوە کە تایبەتە بە چی، وە مەزهەبی ئەهلی عیلمیش لەم بارەیەوە بریتیە لەوەی کۆمەڵەی دووەم، کە دەڵێن لە ئایەتەکە کە باسی جەڵد دەکات مەبەستی

زیناكارانی ژن نییە بەڵكو مەبەستی زیناكارانی كچە، نەك وەكو كۆمەڵەی یەكەم كە پێیان وایە بەشێك لە ئایەتەكە نەسخ بووەتەوە و بەشەكەی تر هێشتا موحكەمە، واللە اعلم .

**٣٨٤** - وە كۆمەڵێك لە ئەهلی سەردەمی خۆمان و نزیكی سەردەمی خۆمان چوونە بۆ واجب بوونی كار كردن بە فەرموودەی عبادة لەسەر ڕوویەك، بەم شێوەیە بە كتێبی اللە سەد جەڵدیان واجب كرد بۆ زیناكارانی كچ، لەگەڵ ساڵێك دوورخستنەوەیان بە سوننەتی رسول اللە ﷺ، وە لەسەر زیناكارانی ژن جەڵدیان واجب كرد بە كتێبی اللە، و بەردبارانیش بە سوننەتی رسول اللە ﷺ، وە وتیان : علي بن ابي طالب رضي اللە عنە كاری بەمە كردووە، وە أُبَي بن كعب یش رضي اللە عنە فەتوای پێداوە، وە وتیان : لەو هەواڵانەی كە الشافعي و جگە لەو بەڵگەیان پێیان هێناوەتەوە دەربارەی لابردنی جەڵد لەسەر زیناكارانی ژن هیچ بەڵگەیەك نییە كە هەڵگرتنی جەڵدیان لەسەر واجب بكا، چونكە دەربارەیان یەك باسی جەڵدی تێدا نییە، دەكرێ پێغەمبەر ﷺ جەڵدی كردبێتن، و لە فەرموودەشدا باسی نەكردبێ .

وە دەكرێ باسكردنەكەیان كورت كردبێتەوە لە فەرموودەدا، چونكە ئەوان جەڵدیان بە جێگیری بینیوە لەسەر زیناكاران لە كتێبی اللە دا، بەم هۆیەشەوە بێ پێویست بوون لەوەی كە لە سوننەتدا باسی بكەن، بەڵكو باسی ئەو بەردبارانەیان كردووە كە لە كتێبی اللە دا باس نەكراوە، تاكو باسكردنی بە

ناو خەڵكیدا بڵاو ببێتەوە، وە لە ناو عەوامیشدا بڵاو ببێتەوە، تاكو بزانن كە ئەوە سوننەتێكە لە رسول الله وە ﷺ، بەم شێوەیەش ناتوانن ئینكاری لێبكەن، وەكو ئەوەی كە خەڵكانێك لە ئەهلی ئارەزوو و بیدەع كردوویانە .

: واتە ئەم كۆمەڵەیە جیاوازیان هەیە لەگەڵ الشافعي وماوەلانی، ئەمان پێیان وایە كە زیناكارانی ژنیش دەبێ جەڵد بكرێن و پێیان وانیە جەڵد مەڵگیرابێ لەسەریان .

**٣٨٥** - ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : عمر بن الخطاب رضي الله عنه وتاریدا، و سوپاس و ستایشی الله ی كرد، وە فەرمووی : خەڵكینە، ئاگادار بن ئەم بەردباران كردنە حەدێكە لە حەدەكانی الله، بۆیە لێی مەڵمەخەڵەتێن، وە بەڵگەی ئەمەش بریتیە لەوەی كە رسول الله ﷺ بەردبارانی ئەنجامداوە، وە ابو بكر یش بەردبارانی ئەنجامداوە، وە ئێمەش لە دوایانەوە بەردبارانمان ئەنجامداوە، وە نیازم وابوو لە سوچێكی موصحفەكەدا بنوسم : عمر بن الخطاب و عبدالرحمن بن عوف و فڵان و فڵان شاهێدیان داوە كە رسول الله ﷺ بەردبارانی ئەنجامداوە، ئاگادار بن لە دوای ئێوە چەند قەومێك دێن بەردباران، و دەجال، و سزای گۆڕ، و شەفاعەت بە درۆ دەخەنەوە، وە قەومێكیش لە ئاگر دێنە دەرەوە دوای ئەوەی كە سوتابوون .

**٣٨٦** - الشيباني وتى : گوێم لە عامر بوو دەیوت : علي بن ابي طالب ئافرەتێكی جەڵد كرد پاشان بەردبارانی كرد، فەرمووی : بە كتێبی الله جەڵدم كرد، وە بە سوننەت بەردبارانم كرد .

**٣٨٧** - لە الشعبي ەوە : علي لە ڕۆژی پێنجشەممەدا شراحة ی جەڵد كرد، وە ڕۆژی هەینی بەردبارانی كرد، فەرمووی : بە كتێبی الله جەڵدی دەكەم، وە بە فەرمایشتی رسول الله ﷺ بەردبارانی دەكەم .

**٣٨٨** - الثعلبي وتى : گوێم لە الشعبي بوو دەیوت : پیاو و ئافرەتی بە تەمەن : سەد جەڵد دەكرێن، و بەردبارانیش دەكرێن .

جا بە الشعبي وترا : هەردووكیان لەسەر كۆدەكرێنەوە؟

وتى : ابو الحسن علي بن ابي طالب بۆ فلاّن و فلاّن ئەمەی كرد لەم چاڵەدا، سەد جەڵدی كردن و بەردبارانی كردن .

---

: دیارە مەبەستی لە بە تەمەن ئەوانەیە كە هاوسەریان هەیە یان پێشتر هەیانبووە .

**٣٨٩** - لە حبة بن جوين ەوە لە علي ەوە : ئافرەتێك هات بۆ لای، وتى : من زینام كردووە .

فەرمووی : لەوانەیە بۆ لات هاتبێتن لە کاتێکدا تۆ لە جێگاکەتدا خەوتویت و بە زۆر لەگەڵت کرابێ .

وتی : بە گوێڕایەڵی خۆم زینام کردووە نەك بە زۆر .

فەرمووی : لەوانەیە غەسپت کردبێ لەسەر خۆت .

وتی : غەسپم نەکردووە .

جا زیندانی کرد، وە کاتێك کە منداڵی بوو وە کوڕەکەی پێگەیشت، جەڵدی کرد، پاشان فەرمانی کرد تا لای شانی چاڵێکی بۆ هەڵبکەنن لەو شوێنە فراوانەدا - واتە بۆ ئافرەتەکە - ، پاشان کرایە ناویەوە، پاشان بەردبارانی کرد و بەردبارانمان کرد، وە فەرمووی : بە کتێبی الله جەڵدم کرد، وە بە سوونەتی محمد ﷺ بەردبارانم کرد .

**٣٩٠** - أُبَي بن كعب رضي الله عنه فەرمووی : پیاو ئەگەر حصن نەکرابێ - واتە ژنی نەهێنابێ - ئەوا جەڵد دەکرێ، پاشان دوور دەخرێتەوە، وە وە ئەوەی کە حصن کراوە جەڵد دەکرێ، پاشان بەردباران دەکرێ .

**٣٩١** - أبي بن كعب فەرمووی : ئەوانەی سەڵتن جەڵد دەکرێن و دوور دەخرێنەوە، وە ئەوانەی سەڵت نین جەڵد دەکرێن و بەردباران دەکرێن .

٣٩٢ - **ابو عبدالله** وتی : وه له‌مانه بریتیه له فه‌رمایشتی الله عز و جل : ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾ [البقرة : ١٥٠]، جا پێغه‌مبه‌ر ﷺ له سه‌فه‌ره‌كه‌یدا ڕووه‌و ئه‌و شوێنه نوێژی كرد كه وڵاخه‌كه‌ی ده‌یبرد .

٣٩٣ - له جابر بن عبدالله وه رضي الله عنه : رسول الله ﷺ له گه‌شته‌كه‌یدا له‌سه‌ر وڵاخه‌كه‌ی نوێژی سوننه‌تی ده‌كرد ڕووه‌و خۆرهه‌ڵات، جا ئه‌گه‌ر بیویستایه نوێژه فه‌رزه‌كان بكا ئه‌وا داده‌به‌زی و ڕووه‌و قیبله نوێژی ده‌كرد .

٣٩٤ - جابر بن عبدالله فه‌رمووی : رسول الله ﷺ له گه‌شتدا نوێژی سوننه‌تی ده‌كرد له‌سه‌ر وڵاخه‌كه‌ی ڕووه‌و ئه‌و شوێنه‌ی وڵاخه‌كه‌ی ده‌یبرد، جا ئه‌گه‌ر بیویستایه نوێژی فه‌رز بكا، ئه‌وا له‌سه‌ر وڵاخه‌كه‌ی داده‌به‌زی و ڕووی ده‌كرده قیبله .

٣٩٥ - جابر بن عبدالله ده‌یفه‌رموو : پێغه‌مبه‌رم ﷺ بینی له‌سه‌ر وڵاخه‌كه‌ی نوێژه نافیله‌كانی - واته سوننه‌ته‌كان - ده‌كرد به هه‌موو ئاڕاسته‌یه‌كدا، به‌ڵام دوو سه‌جده‌كه‌ی نزمتر ده‌كرد له ڕكوعه‌كه و ئیشاره‌تی ده‌كرد .

**٣٩٦** - جابر بن عبدالله فەرمووی : لە غەزای ئەنماردا رسول الله م ﷺ بینی نوێژی سوننەتی دەکرد لەسەر وڵاخەکەی ڕووەو خۆرهەڵات .

**٣٩٧** - عبدالله بن عامر بن ربیعة لە باوکیەوە فەرمووی : رسول الله م ﷺ بینی لەسەر وڵاخەکەی نوێژە نافیلەکانی دەکرد ڕووەو هەموو لایەك .

**٣٩٨** - عبدالله بن عامر بن ربیعة وتی : رسول الله م ﷺ بینی نوێژی دەکرد لە کاتێکدا لەسەر وڵاخ بوو، وە بە سەری ئیشارەتی دەکرد پێش ئەوەی ڕوو بکاتە هەر لایەك، وە رسول الله ﷺ ئەمەی نەدەکرد لە نوێژە فەرزەکاندا .

**٣٩٩** - عبدالله بن عامر بن ربیعة وتی : عامر رسول الله ی ﷺ بینی نوێژی دەکرد لەسەر پشتی وڵاخەکەی .

**٤٠٠** - شعیب ڕایگەیاند لە الزهري ەوە، پرسیاری لێکردووە سەبارەت بە گەشتیارێك کە بە جوانی لەسەر پشتی وڵاخەکەی نوێژی کردبێ و ڕووی لە خۆرهەڵات بێ، یان خۆرئاوا؟

ئەویش وتی : سالم بن عبدالله بۆی باسکردم لە عبدالله بن عمر ەوە رضي الله عنهما : رسول الله ﷺ نوێژی دەکرد لەسەر پشتی وڵاخەکەی، گوێی بەوە نەدەدا کە ڕووی لە کوێیە، وە بە سەری ئیشارەتی دەکرد، وە ابن عمر یش هەروای دەکرد .

**٤٠١** - سالم وتی : ابن عمر به شەو نوێژی دەكرد لەسەر پشتی وڵاخەكەی لە كاتێكدا گەشتیار بوو، وە گوێی بەوە نەدەدا كە ڕووی لە كوێیە . ابن عمر فەرمووی : رسول الله ﷺ نوێژی دەكرد ڕووەو هەر لایەك كە لەسەر پشتی وڵاخەكەی بوو، وە وە وتری لەسەر دەكرد، جگە لەوەی كە نوێژە فەرزەكانی لەسەر نەدەكرد .

**٤٠٢** - الزهري بۆی باسكردین دەربارەی پیاوێكی گەشتیار كە نوێژی سوننەتی كردووە لە كاتێكدا لەسەر پشتی وڵاخەكەی بووە، وە ڕووی لە خۆرهەڵات یان خۆرئاوا بووە وتی : سالم بن عبدالله بۆی باسكردین لە عبدالله بن عمر ـەوە : رسول الله ﷺ نوێژی دەكرد لە كاتێكدا لەسەر پشتی وڵاخەكەی بوو، گوێی بەوە نەدەدا كە ڕووی لە كوێیە .

**٤٠٣** - لە عبدالله بن عامر بن ربيعة ـوە لە باوكیەوە وتی : رسول الله ﷺ لەسەر وڵاخەكەی نوێژی دەكرد ڕووەو ئەو شوێنەی كە وڵاخەكەی دەیبرد .

وە وتی : سالم بن عبدالله هەمان شتی گێڕاوەتەوە لە باوكیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ .

**٤٠٤** - لە نافع ـەوە لە ابن عمر ـەوە رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ لەسەر وڵاخەکەی نوێژی نافیلەی دەکرد ڕووەو ئەو شوێنەی کە وڵاخەکەی دەیبرد . نافع وتی : وە ابن عمر یش دەیکردەوە .

**٤٠٥** - ابن دینار لە ابن عمر ـەوە : لە گەشتدا لەسەر وڵاخەکەی نوێژی دەکرد ڕووەو ئەو شوێنەی کە وڵاخەکەی دەیبرد، وە دەیفەرموو : رسول الله ﷺ لە گەشتدا ئاوای دەکرد .

**٤٠٦** - عبدالله بن دینار وتی : ابن عمر م بینی لەسەر وڵاخەکەی نوێژی دەکرد ڕووەو ئەو شوێنەی وڵاخەکەی دەیبرد، وە دەیفەرموو : رسول الله ﷺ ئەمەی دەکرد .

**٤٠٧** - لە حفص بن عاصم لە ابن عمر : لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەمان شتی گێڕاوەتەوە .

**٤٠٨** - ابن عمر فەرمووی : رسول الله م ﷺ بینی لەسەر گوێدرێژ نوێژی دەکرد وە لەو کاتەدا بەرەو خەیبەر دەڕۆشت .

**٤٠٩** - سعید بن جبیر وتی : عبدالله بن عمر پێی ڕاگەیاندم : کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر وڵاخەکەی نوێژی دەکرد، کە لەو کاتەدا لە مەککەوە دەگەڕایەوە بۆ مەدینە، بە ملکەچی، ڕووەو ئەو شوێنەی وڵاخەکەی دەیبرد، پاشان عبدالله

ئایەتی : ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾ [البقرة : ١١٥] خوێندەوە، وە فەرمووی : دەربارەی ئەمە دابەزی .

**٤١٠** - لە ابن عمر ـەوە : رسول الله ﷺ لەسەر وڵاخەکەی نوێژی دەکرد ڕووەو ئەو شوێنەی وڵاخەکەی دەیبرد، ئیشارەتی دەکرد، وە سوجدەی نزمتر دەکردەوە لە ڕکوع .

**٤١١** - أنس بن سیرین وتی : أنس بن مالك م بینی لەسەر گوێدرێژەکەی ڕووەو خۆرهەڵات نوێژی دەکرد .

وتم : تۆم بینی ڕووەو غەیری قیبلە نوێژت دەکرد؟!

فەرمووی : ئەگەر رسول الله م ﷺ نەبینیایە بیکا . واتە : نەمدەکرد .

**٤١٢** - لە أنس بن مالك ـەوە رضي الله عنه : رسول الله ﷺ لە گەشتدا بە ملکەچی لەسەر حوشترەکەی نوێژی دەکرد ڕووەو غەیری قیبلە .

**٤١٣** - محمد بن یحیی بۆی باسکردین ابو عاصم بۆی باسکردین لە یونس بن الحارث ـەوە وتی : ابو بردة بۆی باسکردم لە ابو موسی وە رضي الله عنه : کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : نوێژ لەسەر پشتی وڵاخ : ئاوا و ئاوا و ئاوایە، وە ابو عاصم ئاماژەی بۆ ڕاستی و چەپی و بەردەمی کرد .

**٤١٤ - ابو عبدالله** وتی : جا ئەو کۆمەڵەیەی کە پێیان وابوو دەکرێ قورئان بە سوننەت نەسخ ببێتەوە وتیان : پێغەمبەر ﷺ فەرزبوونی ڕوو کردنە قیبلەی بۆ گەشتیار نەسخ کردەوە بە سوننەتەکەی ئەگەر بە سواریەوە نوێژی سوننەت بکا، بۆیە ئایەتەکە نەسخ بۆوە بۆ گەشتیاری نوێژخوێن کە بە سواریەوە نوێژی سوننەت دەکا، بەڵام جێگیر و بەکارهێنراوە بۆ باقی نوێژخوێنان .

بەڵام ئەوانی تر سەرپێچی ئەمەیان کرد، و وتیان : بەڵکو ئایەتەکە هەمووی جێگیرە، هیچی تێدا نەسخکراو نیە، تەنها ئەوە نەبێ کە گشتیە و بۆ مەبەستێکی تایبەتە، مەبەست پێی هەموو نوێژخوێنان بووە، جگە لەو گەشتیارەی کە لە حاڵەتی سواریدا نوێژی سوننەت دەکا، بۆیە کردنی نوێژی سوننەت لە گەشتدا ڕووەو غەیری قیبلە سوننەتێکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، وە ڕوونکەرەوەی لایەنە تایبەتەکەی ئایەتەکەیە، بەڵام نەسخ کەرەوەی هیچ بەشێکی نییە .

---

: واتە الله لە قورئاندا فەرزی کردووە کە لە کاتی نوێژ کردن ڕوو بکەینە قیبلە، جا کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر وڵاخەکەی نوێژی ڕووە و غەیری قیبلە کردووە کۆمەڵێك پێیان وابووە کە بەم کارەی بەشێك لە ئایەتەکەی نەسخ کردۆتەوە، بەڵام کۆمەڵەکەی تر پێیان وانیە نەسخی کردبێتەوە تەنها پێیان وایە کە ئەو ﷺ ڕوونی کردۆتەوە بۆ گەشتیاری سواری دروستە لە غەیری

ڕووەو قیبلە نوێژ بکا و الله تەنها مەبەستی لە باقی نوێژەکانی تر بووە نەك ئەو گەشتیارەی بە سواری وڵاخەکەیەوە نوێژی سوننەت دەکا .

**٤١٥** - **ابو عبدالله** وتی : وە لەمانە فەرمایشتی : ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾ [**المائدة** : ٦]، جا یەکێك لە دوو کۆمەڵەکە وتیان : الله لە ئایەتەکەدا شوشتنی پێیەکانی واجب کردووە، پێغەمبەر ﷺ بە سوننەتەکەی دەلالەتی لەوە کردووە، پێیەکانی شوشت، و فەرمانی بەوە کردووە، و هەڕەشەی کردووە لە وازهێنان لە شوشتنیان، وە بەڵێنی پاداشتی داوە لەسەر شوشتنیان .

پاشان مەسحی سەر خوفەکانی کرد و فەرمانی بەوەش کرد، جا شوشتنیان نەسخ بۆوە ئەگەر داپۆشرابێتن بە خوف - خوف وەکو گۆرەوی وایە - کە لە پێی کردبێ لە کاتێکدا لەسەر طهارة بێ - واتە بەبێ لەشگرانی و بە دەستنوێژەوە خوفەکانی لەپێ کردبێ - ، وە فەرز بوونی شوشتنیان مایەوە ئەگەر هیچی لە پێدا نەبێ .

بەڵام کۆمەڵەکەی تر سەرپێچی ئەمەیان کرد، و وتیان : الله شوشتنی هەردوو پێی فەرز کردووە لە ئایەتەکەدا ئەگەر خوفی لە پێ نەکردبێ، و لەسەر طهارة بن، وە بەمە مەبەستی فەرزبوونی شوشتن بووە بە تایبەتی نەك بە گشتی،

بۆیە مەسح سوننەتێکە لە رسول الله وە ﷺ ڕوون کەرەوەی گشتێتی ئایەتەکەیە، و نەسخ کەرەوەی هیچ شتێکی نییە .

٤١٦ - **ابو عبدالله** وتی : وە کۆمەڵێك لە ئەهلی ئارەزوو و بیدەع لە خەواریج و رافیزە ئینکاریان کرد لە مەسحی سەر خوف، وە لاقی ئەوەیان لێدا کە ئەمە جیاوازە لە کتێبی الله، وە هەر کەسیش ئینکاری لەمە کرد ئەوا ئینکاری لە هەموو ئەو سوننەتانە کردووە کە باسمان کردن، وە ئەوانەش کە باسمان نەکردوون، وە ئەمە خروجە لە جەماعەتی ئەهلی ئیسلام .

٤١٧ - **ابو عبدالله** وتی : وە لەمانە بریتیە لە فەرمایشتی الله عز و جل : ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ﴾ **[النساء : ١١]**، وە ئەوەشی کە بە دوایدا دێ، وە لە کۆتایی سورەتەکەدا فەرموویەتی : ﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ﴾ **[النساء : ١٧٦]**، جا الله تبارك و تعالى لەم ئایەتانەدا باسی میراتی منداڵی کردووە لە باوکان و دایکان، وە باوکان و دایکان لە منداڵەکان، وە دوو هاوسەر یەکێکیان لەوەی تر، وە باقی ئەوانەی میرات لە خزم دەگرن هەندێکیان لە هەندێکی تریان وەکو باسکردنێکی گشتی، تایبەت نییە بە بەشێك لە باوکان و مندالآن و بە بێ بەشەکەی تری، وە بە بەشێك لە هاوسەران بە بێ بەشەکەی تری، بەڵام هەواڵی جێگیر هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ : کە کافر میرات لە موسڵمان ناگرێ، و موسڵمان لە کافری ناگرێ، وە ئەهلی فەتوا لە زانایانی وڵاتان، لە ئەهلی ئەثەر و بۆچوون هەموویان، کۆکن لەسەر قسەکردن

به گشتی هەروەکو شوێنکەوتنێك بۆ ئەو هەواڵەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی ئەمە گێڕدراوەتەوە .

---

: واتە زانایان بە گشتی دەڵێن کافر و موسڵمان میرات لە یەکتر ناگرن .

**٤١٨** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (موسڵمان میرات لە کافر ناگرێ، و کافر میرات لە موسڵمان ناگرێ) .

**٤١٩** - یونس وتی : پرسیارم لە ابن شهاب کرد : ئایا موسڵمانان و نەصرانیەکان میرات لە یەکتر دەگرن؟

ابن شهاب وتی : رسول الله ﷺ بڕیاری داوە کە میرات ناگرن، وە ابو بکر و عمر و عثمان یش .

یونس وتی : ابن شهاب پێی ڕاگەیاندم لە علي بن الحسين لە أسامة بن زيد رضي الله عنهما : کە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (موسڵمان میرات لە کافر ناگرێ، و کافر میرات لە موسڵمان ناگرێ) .

٤٢٠ - **ابو عبدالله** وتی : جا ئەوانەی پێیان وایە قورئان بە سوننەت نەسخ دەبێتەوە وتیان : قورئان باسی میرات گرتنی منداڵانی لە باوکان کردووە، لەگەڵ باوکان لە منداڵان، و دوو هاوسەر یەکێکیان لەوی تر، وە موسڵمانی تایبەت نەکردووە بە بێ کافر، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە سوننەتەکەی میراتی موسڵمان لە کافر، و کافر لە موسڵمانی نەسخ کردەوە، خۆ ئەگەر ئەمە نەبوایە ئەوا میراتی یەکێکیان لەوی تر بە کتێبی الله جێگیر دەبوو .

بەڵام ئەوانی تر ئینکاریان لەمە کرد و وتیان : ئەمە لەو گشتیانەیە کە مەبەست پێی تایبەت بووە, چونکە هیچ شتێکمان لە هەواڵ بۆ نەهاتووە کە موسڵمانان میراتیان لە کافران گرتبێ، یاخود لە سەرەتای ئیسلامدا کافران میراتیان لە موسڵمانان گرتبێ، بەڵکو هەواڵی جێگیر لای ئەهلی عیلم ئەوەیە کە عقیل و طالب میراتیان لە ابو طالب گرت، بەڵام جعفر و علي میراتیان لێ نەگرت, چونکە بە کافری مرد، و عقیل و طالب یش کافر بوون، بۆیە میراتیان لێی گرت بە بێ جعفر و علي رضي الله عنهما، چونکە ئەوان موسڵمان بوون، جا میراتیان لێی نەگرت .

وە مردنی ابو طالب لە کاتێکدا بوو کە پێغەمبەر ﷺ لە مەککە بوو لە سەرەتای ئیسلامدا، ئایەتەکانی میراتیش لە مەدینە دابەزین .

: مەبەستی ئەوەیە ابو طالب لە سەرەتای ئیسلامەوە مرد و کوڕە موسڵمانەکانی میراتیان لێی نەگرت، و ئایەتەکانی میراتیش لە مەدینە دابەزین، جا بەم پێیە مانای وایە کە موسڵمانان هەر لە سەرەتاوە میراتیان لە کافران نەگرتووە تاکو لە دواتردا نەسخ ببێتەوە .

**٤٢١** - لە أسامة بن زید ـەوە رضي الله عنه فەرمووی : یا رسول الله ﷺ، ئایا دادەبەزی بۆماڵەکەت لە مەککە؟

فەرمووی : (جا عقیل هیچ ماڵ و خانوویەکی بۆمان جێهێشتووە؟)

عقیل میراتی لە ابو طالب گرتبوو، ئەو و طالب میراتیان لێگرت، بەڵام جعفر و علي هیچ میراتیان لێ نەگرت, چونکە موسڵمان بوون، عقیل و طالب یش کافر بوون .

**٤٢٢** - لە علي بن حسین : علي بن ابي طالب میراتی لە ابو طالب نەگرت، بەڵکو عقیل و طالب میراتیان لێگرت .

علي بن الحسین وتی : لەبەر ئەمەبوو کە وازمان لە بەشەکەمان هێنا لە گەلەکەمان .

**٤٢٣** - لە أسامة بن زید ـەوە لە رسول الله ـوە ﷺ فەرمووی : (موسڵمان میرات لە کافر ناگرێ، و کافر لە موسڵمانی ناگرێ) .

وە فەرمووی : رسول الله ﷺ میراتی لە ابي طالب دا بە عقیل و طالب، بەڵام میراتی نەدا بە علي و جعفر .

**٤٢٤** - لە الزهري بەم سەنەدەوە، وتی : لەبەر ئەمەبوو کە وازمان لە بەشەکەمان هێنا لە گەلەکەمان .

**٤٢٥** - **ابو عبدالله** وتی : ئەوان وتیان : جا کە جێگیر بوو بەوەی کە باسمان کرد : ئەوەی کە میرات گرتن لە نێوان موسڵمانان و کافران هەردەم پچڕاو بووە، بۆمان دەرکەوت کە ئەو ئایەتانەی دەربارەی میرات دابەزیون، ئەگەر چی دەرئەنجامەکەشیان گشتی بێ لە خوێندنەوەدا، بەڵام تایبەتن لە واتادا، مەبەست لێیان بریتیە لە : موسڵمانە ئازادەکان بە تایبەتی، ئەگەر کەسێکیان تێدا نەبێ کە بکوژی ئەنقەست بێ بۆ مردووەکە، وە هیچ شتێك لەم ئایەتانە نەسخ نەبۆتەوە .

**٤٢٦** - **ابو عبدالله** وتی : وە ئەوانەی کە وتیان الله هیچ شتێکی لە حوکمەکانی کتێبەکەی بە سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ نەسخ نەکردۆتەوە، بەڵگەیان هێنایەوە بەوەی کە وتیان : الله ئەو کتێبەی خۆی کە هیچ شتێکی لێ بزر نەبووە کردویەتی بە بەڕاست خەرەوە و شاهێد بەسەر ئەو کتێبانەی کە ڕابردوون, وە نەسخ کەرەوەی بەشێکی - واتە الله قورئانی کردووە بە بەڕاستخەرەوە و شاهێد بۆ تەورات و ئینجیل و بەشێکیشیانی بە قورئان نەسخ کردۆتەوە - چونکە کردویەتی

به كۆتا كتێب، فەرمانیشی كردووە بەوەی دەست بە گوریسەكەیەوە بگرین، جا چۆن دەكرێ غەیری خۆی نەسخی هەندێكی كردبێ و حوكمەكانی بگۆڕێ؟ وتیان : وە پەروەردگارمان پێی ڕاگەیاندووین كە شیفا و نورە بۆ سینەكان، و هیچ شتێكی لە قورئان جیانەكردۆتەوە لە شتێكی تری، خۆ ئەگەر بەشێكی بە سوننەت بگۆڕدرایە ئەوا بەشێكی دەبووە كوێری بۆ ئەو كەسەی كە شوێنی دەكەوێ، وە پێویست دەبوو لەسەر دروستكراوەكان كە دانیان بە حوكمەكانیدا ناوە حوكمیان پێ نەكردایە هەتاكو بۆ عیلمی سوننەت نەگەڕێن : ئاخۆ بەشێك لە حوكمەكانی گۆڕیوە یان نەیگۆڕیوە؟ ئەو كاتیش نەدەبووە شیفا بۆ دڵەكان .

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (حەڵاڵ ئەوەیە كە الله لە كتێبەكەیدا حەڵاڵی كردووە، و حەڕام ئەوەیە كە الله لە كتێبەكەیدا حەڕامی كردووە)، خۆ ئەگەر سوننەت بەشێك لە حوكمەكانی نەسخ كردایەتەوە، ئەوا بەشێك لە حەرام كردنەكانی الله لە كتێبەكەیدا حەڵاڵ دەبوون، وە بەشێك لە حەڵاڵ كردنەكانی حەڕام دەبوون، وە لەسەر هیچ كەس حوججە واجب نەدەبوو بە قورئان هەتاكو هەموو سوننەتی نەزانیایە، و هەتاوەكو نەیزانیایە كە چی لێ گۆڕاوە بە سوننەت .

وتیان : پێغەمبەر ﷺ هیچی حەڵاڵ نەکردووە و حەڕامی نەکردووە ئیللا الله لە کتێبەکەیدا حەڕامی کردووە، جا بە دەق بێ، یان بەوە بێ کە واجبی کردووە بە گوێڕایەڵی .

وە کۆدەنگی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و تابعین لەسەر ئەوەیە کە بنچینەکانی زانست و حوکمەکان لە کتێبی الله ـوەیە، جا تێیدایە کە ڕوون و مەفهومە لە خوێندنەوەکەیەوە، وە تێیدایە بە گەڕان لە لایەن ئەهلی عیلم و تێگەیشتن لە الله ـوە دەدۆزرێتەوە، خۆ ئەگەر سوننەت نەسخکەرەوەی بەشێك لە حوکمەکانی بێ، ئەوا بۆ کەس حەڵاڵ نەبوو کە ڕووداوەکەی بشوبهێنێ بە بنچینەیەك لە بنچینەکانی، تاکو ئەم بنچینەیە نەزانێ : ئاخۆ نەسخ بۆتەوە یان نا؟ جا بەردەوام پێگەی بە مەزن ڕادەگرن و فەرمان بە شوێنکەوتنی دەکەن، وە فەرمان بە وازهێنانی هیچ شتێکی ناکەن بۆ غەیری خۆی .

وە زۆرێك لەوان بینیویانە زۆرێك لەو شتانەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە بە ڕاستخەرەوەکەی لە کتێبی الله دایە، بەوە دڵنیا دەبنەوە کە بەڕاست خەرەوەی سوننەتە، وە هیچی لێ ناگۆڕێ، خۆ ئەگەر لێی بگۆڕیایە، ئەوا بە دوا گەڕان بۆ بە ڕاستخستنەوەی سوننەت لە قورئاندا ئەولاتر نەدەبوو لە بە دوا گەڕان بۆ بە ڕاستخستنەوەی قورئان لە سوننەتدا، وە پەروەردگاریشمان پێی ڕاگەیاندووین کە محمد ی ﷺ ناردووە تاکو ئەو کۆمەڵە شتە بۆ خەڵك

ڕوون بکاتەوە کە بۆی دابەزیوە، بۆ ئەوە نەیناردووە کە هەندێك لەو شتانە بەتاڵ بکاتەوە کە بۆی دابەزیوە و بۆیان ڕوون بکاتەوە کە الله فەرمانی پێکردووە تەبدیلی بکات و بیگۆڕێ بە فەرمایشتی خۆی .

جا الله فەرمایشتێکی خۆی نەسخ دەکاتەوە بە فەرمایشتێکی تری، فەرمایشتەکەی نەسخ ناکاتەوە بە فەرمایشتی پێغەمبەرەکەی ﷺ, چونکە فەرزەکانی بە کەلامەکەی لەسەر واجب کردوون، وە زۆرێکی کردووە بە موجمەل، فەرمانیشی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە کە بە تەفسیر کردنی ئەو فەرزانەی کە موجمەلی کردوون، وە پێی ڕاگەیاندوون کە کە پێغەمبەری ﷺ کردۆتە ڕوونکەرەوەی ئەوانە لە لایەن پەروەردگاریەوە، ڕێگەی نەداون کە حوکمی کتێبەکەی بگۆڕن کە کردوویەتی بە حوججە بەسەر دروستکراوەکانیەوە، و بەوە بیانووی بڕیون، خۆ ئەگەر گۆڕینی هەندێ لە حوکمەکانی بە سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ گەورەکردنی بەندەکانی بووایە : زاناکەیان ئەگەر چی زاناش بووایە بە سوننەتەکان بە گشتی، ئەمین نەدەبوو لەوەی کە فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە چەند متمانەیەك گێڕاویانەتەوە ئەم گوێی لێ نەبێ، کە پێغەمبەر ﷺ بەوە هەندێك لە حوکمەکانی قورئانی پێگۆڕیوە، جا ئەو کات ئیقامە حوججەی لەسەر نابێ لە حوکمێك لە

حوکمەکانی قورئاندا ئیللا لەوە نەبێ کە هەموو زاناکانی ئوممەت کۆدەنگن دەربارەی .

وە جاهیلیش ئەگەر لای جێگیر بێ کە سوننەت نەسخی هەندێ لە حوکمەکانی قورئانی کردۆتەوە ئەوا دانی بە حوکمێکی الله نەدەنا ئیللا ئەمین نەدەبوو لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ گۆڕیبێتی و نەسخی کردبێتەوە بە فەرموودەیەك کە بۆ زاناکان ماوەتەوە، و ئەم نایزانێ، جا ئەو کات حوججەی الله بە قورئان لەسەر بەندەکانی لادەچێ .

**٤٢٧ - ابو عبدالله** وتی : وە ئەوانەی بۆچوونیان وابوو کە الله هەندێك لە حوکمەکانی قورئانی بە سوننەت نەسخ کردۆتەوە بەڵگەیان هێنایەوە، و وتیان : قورئان و سوننەت دوو شتن، الله تعالی عیلم و کردەوەی بەوانە فەرز کردووە لەسەر دروستکراوەکانی، وە یەکێکیانی هاوتای ئەوی تر کردووە و جیاکاری نەکردووە لە نێوانیاندا، جا جێگایان لە ڕووی بە ڕاست خستنەوەوە یەك شتە، وە هەردووکیان لە لایەن اللە وەن، الله عزَّوَجَل دەربارەی دۆستەکەی خۆی إبراهیم علیه السلام قسە دەکا کە پاڕاوەتەوە لە پەروەردگاری بۆ نەوەکانی، فەرموویەتی : ﴿رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡ﴾ **[البقرة : ١٢٩]** .

وە فەرموویەتی : ﴿هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ **[الجمعة : ٢]** .

وه فەرموویەتی : ﴿كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ [البقرة : ١٥١] .

وه فەرموویەتی : ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ [آل عمران : ١٦٤] .

وه فەرموویەتی : ﴿وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦ﴾ [البقرة : ٢٣١] .

وه فەرموویەتی : ﴿وَأَنزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ﴾ [النساء : ١١٣] .

وه فەرموویەتی : ﴿وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ﴾ [الاحزاب : ٣٤] .

**٤٢٨** - الشافعي وتی : الله جل ثناؤه باسی کتێبی کردووە، کە قورئانە، وە باسی حیکمەتی کردووە، جا من گوێم لەو کەسانە بوو کە ڕەزامەند بوون لە ئەهلی زانست بە قورئان دەیان وت : حیکمەت : سوننەتی رسول الله یە ﷺ .

**٤٢٩** - الشافعي وتی : ئەمە لەوە دەچێ کە ئەوان وتیان، چونکە الله باسی قورئانی کرد و بە دوایدا باسی سوننەتی کرد، وە باسی منەتی خۆی کرد بەسەریانەوە بەوەی کە قورئان و حیکمەتی فێر کردوون، جا والله اعلم ناکرێ حیکمەت لێرەدا شتێکی تر بێ جگە لە سوننەتی رسول الله ﷺ، ئەمەش لەبەر

ئەوەیە کە ماوتای کتێبی الله یە، وە الله گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەرەکەی ﷺ، فەرز کردووە، وە مەرجی داناوە لەسەر خەڵکی کە شوێنی فەرمانەکانی بکەون، بۆیە ناکرێ بە وتەیەك بوترێ : فەرزە، ئیللا بە کتێبی الله، پاشان بە سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، نەبێ وە لەوەی باسمان کرد کە الله ئیمان هێنانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ ماوتا کردووە بە ئیمان هێنان بە خۆی، جا سوننەتی رسول الله ﷺ ڕوونکەرەوەی ئەو مانایەیە کە الله مەبەستی بووە و بەڵگەیە لەسەر تایبەت و گشتیەکەی، وە الله ش ئەمەی بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوەکانی نەکردووە جگە لە پێغەمبەرەکەی ﷺ .

**٤٣٠** - قتادة دەربارەی : ﴿**وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ ج**﴾، وتی : سوننەتە .

**٤٣١** - قتادة دەربارەی : ﴿**وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ ج**﴾، وتی : سوننەتە .

**٤٣٢** - روح بن عبادة دەربارەی فەرمایشتی : ﴿**وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ ج**﴾، وتی : سعيد بۆی باسکردین لە قتادة وە وتی : واتە : سوننەت، بەوە مەتن دەکرێتە سەریان .

: بەڕێزان هەندێ جار دەبینن کە دەڵێن قورئان گەورەترە لە سوننەت و هەندێ جاریش دەڵێن هەمان شتن؛ لێتان تێك نەچێ ئەم دوو قسەیە دژ یەك نین، بەڵێ قورئان لە سوننەت گەورەترە بەڵام لە ڕووی کار پێکردن و حوکمەوە هەمان شتن، فەرزێك بە سوننەت فەرز کرابێ یان بە قورئان هەر فەرزە و دەبێ کاری پێ بکرێ، والله اعلم

٤٣٣ - **ابو عبدالله** وتی : ئەم کۆمەڵەیە وتیان : الله تبارك و تعالی ڕوونی کردۆتەوە کە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە خەڵکی فێری قورئان و حیکمەت بکا، جا حیکمەت غەیری قورئانە، کە ئەویش : ئەوەیە کە رسول الله ﷺ کردوویەتی کە لە قورئان باس نەکراوە .

وە هەردووکیان فەرزن، و جیاوازیان لە نێواندا نییە، چونکە هاتنیان یەك شتە، وە الله فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە کە هەردووکیان فێری دروستکراوەکان بکا، لەسەری واجب کردوون کە سوننەت وەرگرن و کاری پێ بکەن، هەروەکو چۆن واجبی کردووە لەسەریان کە کار بە قورئان بکەن، جا ئەو کات واتای هەر یەکێکیان بریتیە لە واتای ئەوی تریان، وە الله عز و جل گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەرەکەی ﷺ واجب کردووە، وە کردوویەتی بە فەرز لەسەر دروستکراوەکانی، هەروەکو فەرزبوونی گوێڕایەڵی کردن بۆ خۆی، لە واجب بووندا هیچ جیاوازیەکیان لە نێواندا نییە، کەواتە بۆچی ئینکاریتان لەوە کرد کە یەکێکیان بەوی تر نەسخ بکاتەوە، چونکە ئەگەر قورئان بە قورئان

نەسخ بکاتەوە، ئەوا فەرمانێکی خۆی بە فەرمانێکی تری نەسخ کردۆتەوە، وە بە هەمان شێوە ئەگەر نەسخی حوکمێکی قورئان بکاتەوە بە سوننەت، ئەوا نەسخی فەرمانێکی ناو کتێبەکەی خۆی دەکاتەوە بە فەرمانێکی خۆی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، هەر کەسیش جیاکاری لە نێوان ئەمانەدا بکا، ئەوا عیلمەکەی کەم و کورتی تێدایە، جا ئەگەر لەبەر ئەوەیان بێ کە قورئان بە گەورە ڕابگرن لەوەی کە هەندێك لە حوکمەکانی بە سوننەت نەسخ ببێتەوە، ئەوا قورئان گەورەیە و لە هەموو شتێك گەورەترە، چونکە کەلامی الله یە، کە الله ش نەسخی کەلامەکەی دەکاتەوە بەتاڵی ناکاتەوە، گەورەیی بۆ ئەو لەم بارەیەوە، بەڵکو نەسخی فەرمان پێکراوێك بە کەلامەکەی خۆی دەکاتەوە بە فەرمان پێکراوێکی تر لە سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ، جا هەردوو فەرمان پێکراوەکە هاوتان، چونکە هەردووکیان حوکمن، قورئانیش گەورەترە لە سوننەت، خۆ ئەگەر بکرایە بۆ ئەوانەی کە قورئان بە گەورە ڕادەگرن - کە قورئان خۆی هی ئەوەیە بە گەورە ڕابگیرێ - لەوەی کە ئینکاری لەوە بکەن کە الله نەسخی حوکمێکی ناوی بکاتەوە بە سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئەوا دەبوو ئینکاری لەوەش بکا کە قورئان بە سوننەت تەفسیر بکرێ، وە بۆی واجب دەبوو کە قورئان تەرجەمە نەکا ئیللا بە قورئانێکی دابەزیوی هاوشێوەی خۆی نەبێ، جا ئەگەر ئەوەیان بکرایە ئەمەش دەکرا - مەبەستی ئەم کۆمەڵەیە ئەوەیە ئەگەر قورئان بە سوننەت نەسخ نەبێتەوە ئەوا نابێ سوننەت تەفسیریشی بکات - .

جا بە دان پێدانانەکەیاندا کە پێغەمبەر ﷺ قورئانی تەرجەمە و تەفسیر کردووە بە سوننەتەکەی، بەڵگەیە لەسەریان کە ئەوان لەم واتایەوە قورئان و سوننەتیان هاوتای یەکتر کرد، بەڵکو بە قیاسی خۆیان سوننەتیان کرد بە بەرزتر لێی لە کاتێکدا قورئان نازانرێ بە خۆی بەڵکو بە سوننەت دەزانرێ، چونکە سوننەت پێویستی بەوە نیە تەفسیر بکرێ بە قورئان، جا لێرەدا دانیان بەو شتە نا کە ئینکاریان لێکرد، چونکە پێیان وایە کە ئەگەر قورئان سوننەت نەسخی بکاتەوە ئەوا حوججە نیە لە کاتێکدا غەیری خۆی نەسخی دەکاتەوە، اللە پێگەی بە گەورە ڕاگرتووە کە فەرموویەتی : ﴿**وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا**﴾ [**آل عمران : ١٠٣**]، وە کردوویەتی بە شیفا بۆ سینەکان، و جا لەبەر ئەوەی اللە بە گەورە دایناوە ئەوان ئینکاریان کرد لەوەی بە سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، پاشان دانیان بەوەدا نا کە حوکمەکانی ناوی بە گشتی، و مەواڵەکانی ناوی مەدحەکان، هیچی نازانرێن ئیللا بە سوننەت نەبێ .

ئەمما وتەی ئەوانەی کە سەرپێچیان کردین : ئەگەر بکرایە قورئان بە سوننەت نەسخ ببێتەوە، ئەوا دەکرا هەموو حوکمەکانی نەسخ ببێتەوە، جا ئەو کات هیچ حوکمێکی اللە نەدەما کە پابەندکەر بێ. چونکە ئەو پێویستە لەوە گەورەتر بێ، ئەگەر دانی بەوەدا نا کە ناکرێ فەرزە موجمەلەکانی اللە بزانرێ ئیللا بە سوننەت نەبێ، ئەوا دەکرا اللە هەموو فەرزێکی تێ بکا، جا ئەو کات هیچ دەقێك نەدەبوو هەتاکو اللە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکاتە موفەسیری هەموو

فەرزەکانی ناوی، ئەو کاتیش هیچ حوکمێکی الله نەدەما کە بزانرێ ئیللا بە سوننەت نەبێ، بۆیە دانیان بە هەمان ئەو شتە نا کە توند بوون لەسەر ئەو کەسەی کە سەرپێچیان دەکا، وە ماناکەیان زیاتر بوو لایان، چونکە ئێمە وتمان الله هەندێك لە حوکمەکانی قورئان بە سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ نەسخ دەکاتەوە، بەڵام نەسخی هەواڵەکانی و مەدحەکانی نەکردۆتەوە، وە دانیان بەوەدا نا کە زۆربەی ئەو هەواڵ و مەدحانەی الله؛ پێغەمبەر ﷺ تەفسیری کردوون، ئەمەش زیاترە لە واتادا لەوەی کە وتمان .

٤٣٤ - **ابو عبدالله** وتی : ابو ثور پێی وایە ئەو کەسەی دەڵێ : سوننەت قورئان نەسخ دەکاتەوە، بێ ئاگایە، وتی : چونکە ئەو کات پێغەمبەر ﷺ ئەوە حەرام دەکا کە الله حەڵاڵی کردووە و ئەوە حەڵاڵ دەکا کە الله حەرامی کردووە، وتی : ئەمەش بوهتانە، جا ئەوانەی کە سەرپێچی دەکەن کە بێ ئاگاتر و بوهتانەکەیان توندترە وتیان : کێ قسەی لەسەر سەرپێچیکارەکەی کرد کە نایلێ، وە پێی ناشرینی کرد، و کەس نەیوتوە : پێغەمبەر ﷺ ئەوە حەڵاڵ دەکا کە الله حەرامی کردوو، و ئەوەش حەرام دەکا کە الله حەلاڵی کردووە، بەڵکو وتە لای هەموو ئەهلی عیلم ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ هیچی حەڵاڵ نەدەکرد جگە لەوەی کە الله حەلاڵی کردووە، وە هیچی حەرام نەدەکرد جگە لەوەی الله حەرام کردووە .

٤٣٥ - **ابو عبدالله** وتی : تەنها حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن لە لایەن اللە ـوە لە دوو ڕووەوەیە :

یەکەمیان : ئەوەی کە اللە حەڕام کردنی شتێك لە کتێبەکەی دابەزێنێ، و ناوی لێ بنێ قورئان، وەکو فەرمایشتی : ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ﴾ [**المائدة : ٣**] .

وە ئەوەش کە لەمە دەچێ لەوانەی کە لە کتێبەکەیدا حەڕامی کردووە .

وە ڕووی دووەم : ئەوەیە کە لەسەر زمانی جبریل وەحی بۆ دابەزێنێ بە حەرام کردنی شتێك یان حەڵاڵ کردنی یان فەرز کردنی، ئەو کات ناوی بنێ حیکمەت، و ناوی نەن قورئان، هەردووکیان لە لایەن اللە ـوەن هەروەکو فەرموویەتی : ﴿وَأَنزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ [**النساء : ١١٣**] .

وە فەرموویەتی : ﴿وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ﴾ [**البقرة : ٢٣١**]، جا زانایان لێرەدا حیکمەتیان بە سوننەت لێکداوەتەوە، چونکە باسی قورئانی کردووە پاشان فەرموویەتی : وە حیکمەت، بە - پیتی - واو جیاکاری لە نێوانیان کردووە، ئەمەش دەلالەتی لەوە کردووە کە حیکمەت غەیری قورئانە، کە بریتیە لەوەی : رسول اللە ﷺ کردوویەتی کە لە قورئان باس نەکراوە، چونکە ئەگەر لێکدانەوەکە بەم شێوەیە نەبێ ئەوا دەبێتە ئەوەی کە فەرمووبێتی : وە قورئان و قورئانی دابەزاندە سەرت، ئەمەش دوور

دەخرێتەوە، جا بەو کەسەی قسەکەی ابو ثور دەکاتەوە دەوترێ : بۆ ئینکاریت لەوە کرد کە پێغەمبەر ﷺ ئەو شتە بگۆڕێ کە کردنەکەی لە قورئاندا فەرز کراوە، پاشان بە وەحیەك لەسەر زمانی جبریل فەرمانی پێ بکا کار بکات بە غەیری ئەوە بە بێ ئەوەی دەربارەی ئەوە قورئان داببەزێنێ، بەڵکو حیکمەتێك دادەبەزێتە سەری ناوی دەنێ سوننەت، ئەمەش کەس ڕەتی ناکاتەوە جگە لە بۆچوون لاوازێك .

**٤٣٦** - حسان بن عطية وتی : جبريل سوننەتی دادەبەزاندە سەر رسول الله ﷺ هەروەکو چۆن قورئانی دادەبەزاندە سەر، ئەوەشی فێر دەکرد هەروەکو چۆن قورئانی فێر دەکرد .

**٤٣٧** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئاگادار بن من قورئان و هاوشێوەکەیم پێدراوە لەگەڵیدا، ئاگادار بن گومان وایە کە پیاوێکی تێر لەسەر قەنەفەکەی بڵێت : دەست بگرن بە قورئانەوە، جا هەر شتێك تێیدا بینی حەڵاڵ بوو ئەوا حەڵاڵی کەن، وە هەر شتێك تێیدا بینی حەرام بوو ئەوا حەرامی کەن، ئاگادار بن گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەڵاڵ نیە بۆتان، لەگەڵ هەر خاوەن کەڵبەیەك لە ئاژەڵان) .

**٤٣٨** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئاگادار بن من قورئان و ئەوەشم پێدراوە کە هاوتایەتی - هاوتا لە حوکمدا - ، وە گومان وایە تێرێك لەسەر

قەنەفەکەی بڵێ : لە نێوان ئێمە و ئەواندا ئەم کتێبە هەیە، جا هەر حەڵاڵێکی تێدا بوو بە حەڵاڵی دادەنێین، و هەر حەرامێکی تێدا بوو بە حەرامی دادەنێین، جا ئەمە بەو شێوەیە نییە، ئاگادار بن هیچ خاوەن کەڵبەیەك لە ئاژەڵان حەڵاڵ نییە، وە گوێدرێژی ماڵی، و ئەو شتەی کە لە ماڵی ئەو کەسانە هەڵدەگیرێتەوە کە پەیمانیان لەگەڵ بەستراوە، تەنها ئەوە نەبێ کە لێیان بێ پێویست بێ) .

**٤٣٩** - أرطاة بن المنذر وتی : گوێم لە حکیم بن عمیر بوو کە لە عرباض بن سارية وە دەیگێڕایەوە، وتی : پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر دابەزی، و ئەوانەشی لەگەڵ بوون لە هاوەڵانی کە لەگەڵی بوون، فەرمووی : (ئەی عبدالرحمن، سواری ئەسپێك ببە و بانگ بکە : بەهەشت حەڵاڵ نییە تەنها بۆ موسڵمان نەبێ، و کۆببنەوە بۆ نوێژ) .

جا کۆبوونەوە و پێغەمبەریش ﷺ نوێژی کرد و پاشان هەستا و فەرمووی : (ئایا کەسێکی تێر کە ورگی تێر بووە و لەسەر قەنەفەکەی پاڵی داوەتەوە پێی وایە الله هیچ شتێکی حەرام نەکردووە جگە لەوەی لەم قورئانەدا هەیە؟ ئاگادار بن والله من باس و فەرمان و ئامۆژگاریم بە شتانێك کردووە کە وەکو قورئان وایە یان زیاترە، وە هیچ کەڵبەدارێکتان بۆ حەڵاڵ نیە لە ئاژەڵان، لەگەڵ گوێدرێژی ماڵی، وە الله بۆی حەڵاڵ نەکردوون کە بچنە ماڵی پەیمان لێوەرگیراوان مەگەر بە ئیزن نەبێ، وە - بۆی حەڵاڵ نەکردوون - کە ماڵەکانیان بخۆن، و لە

ئافرەتەکانیان بدەن، ئەگەر ئەوەیان پێدان کە لەسەریانە، ئەوە نەبێ کە نەفسی پێ پاك بکەنەوە) .

## والحمدلله رب العالمين

**https://t.me/mejd_henbeli**